ئەنفالی میلیتاریستی لەو ئەنفالە ڕۆحییەی ناو تێکست جیا بکەینەوە، هەر بۆیە سەرچاوەی ئەنفالی میلیتاریستییمان بۆ پێش مێژووی ئەو تێکستە گەڕاندەوە. بێدەنگیی کورد لەئاست ئەنفالدا بێدەنگییەکە لەئاست پیرۆزییدا. بێدەنگییەکە لەئاستی تابوویەکدا، کە ڕێگا بەهیچ ئاڕاستەیەکی دیکەی جیاوازی بیرکردنەوە نادات. هەموو بیرکردنەوەیەکی کوردی بەشێوەیەك لەشێوەکان تەبایی بووە لەگەڵ ئەو گوتارەدا. ئێمە لەخوێندنەوەیەکی دیسپۆتیکییانەی مێژووی خۆماندا، ئەوە بەدی دەکەین، کە کولتووری ئێمە هەر لەسەرەتاوە هیچ ئامادەگییەکی ئەوتۆی نەبووە بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەنفال و خۆپاراستن لێیەوە، وەکو چۆن بەرەنگاربوونەوەی لەئاستی داگیرکاریی ساسانییەکانیشدا نەبووە، ئەویش بەپلەی یەکەم لەبەر نەبوونی ئەو کەرەسانەی، کە دەیانتوانی پرۆسێسی ئەو بەرەنگاربوونەوەیە فەراهەم بکەن. با ئێمە سێ نموونە بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەنفال بێنینەوە: یەکەمیان کورد، دووەمیان تورك و فارس، سێیەمیشیان یۆنان. وەکو گوتمان کورد نەك بەرگرییەکی گەورەی نەکرد، بەڵکو هەر خۆی لەڕێگای ئەدەبی زارەکییەوە بەردەوام پیرۆزیی بەو گوتارەش بەخشیوە. دووەمیان تورك و فارس. ئەوان بێجگە لەوەی بەرگرییان کرد، بگرە دواتر خۆشیان ئەنفالیان بۆ فراوانخوازیی خستە کار. نابێت ئەوەمان لەبیر بچێت، کە عەرەبەکان ڕاستە لەڕووی سەربازییەوە بەسەر فارسەکاندا سەرکەوتن، بەڵام چونکە عەرەبەکان نە هیچ شێوازێکی بەڕێوەبردنیان دەزانی و نە دەشیانزانی ئەنجومەنی یاسادانان چییە، هەروەها هیچ سیستەمێکی ئاسایشیشیان نەناسیبوو،



بەڵکو هەموو ئەوانە زۆر ڕواریانە لەناو سیستەمی هۆزدا بەڕێوە دەچوون، واتە هیچ پلان و ڕێکخستنێکیان نەبوو، بۆیە دوای دامەزراندنی دەوڵەتی خۆیان، هەستان لەڕووی بەڕێوەبردنەوە بەپلەی یەکەم پشتیان بەکولتووری فارس بەست. عەرەبەکان ئەگەرچی سامانێکی گەورەی شیعری و میتۆلۆژیایان هەبوو، لەڕووی هونەری جەنگیشەوە باڵادەست بوون، بەڵام لەبوارەکانی دیکەدا زۆر هەژار بوون. (ئیبن خەلدوون) لەکتێبی (المقدمة)دا ئەم قۆناغە ناو دەنێت (قۆناغی کۆچەری) و پێی وایە ڕێکخستنی سەربازی و دەمارگیری (عصبية) لەکەسانی ناو هۆز پێکدێت. ئەو دەمارگیرییەش لەبیابان مەرجی بنەڕەتیی دامەزراندنی سوپا و بەدیهاتنی سەرکەوتنە. پێی وایە هێزی ئەو کەسە ئازایانەیە، کە دەوڵەت پێکدەهێنێت.

تا سەردەمی (عومەری کوڕی خەتتاب) زمانی فەرمیی دەوڵەت فارسی بوو، نەك عەرەبی. (عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان)یش لێدانی پارەی کردە عەرەبی، ئەگینا تا ئەو کاتەش ساسانی بوو. ئەمەش ڕێگای بەوە دا، کە فارسەکان هەر لەسەرەتاوە بەشێوەیەك لەشێوەکان دەستباڵاییان لەناو حوکمی ئیسلامییدا هەبێت، ئەوە لەکاتێکدا کورد تا بڵێی لێی دوور بوو. وەکو گوتمان کورد تەنها وەکو زمانێك (کە ئەو زمانەش شوناسی ئەو بوو وەکو جۆگرافیا نەك وەکو کولتوور)، ڕووبەڕووی ئەنفال بووەوە. (ئیبن خەلدوون) لە(المقدمة)دا پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت، کە شارستانییەت بەرهەمی شارە و عەرەب بەتەواوی لێی دوورن، بەڵام ئەوە عەجەمەکانن شارستانن، چونکە ئەوان هەر لەسەردەمی دەوڵەتی فارسەوە ئەو

شارستانیەتەیان تێدا چەسپیوە. هەرچی عەرەبەکانن، ئەوە ئەوان ئەو شارستانیەتەیان ناسی و بەو هۆیەوە لەقۆناغی کۆچەرییەوە دەرچوون. دەڵێ ئیشی عەرەب ئەوەیە سەرکردایەتیی دەوڵەت بکات و بیپارێزێت و ئاگای لەسیاسەتەکەی بێت. با سەیری شام بکەین. عەرەبەکان تەنها وەکو جۆگرافیا مامەڵەیان لەگەڵ ئەوێدا نەدەکرد، بەڵکو لەئاستی کولتووری ئەواندا تووشی نامۆییەکی گەورە هاتن. کاتێك ئومەوییەکان خەلافەتیان بردە ئەوێ، هەستیان دەکرد نەك هیچ شتێکی نوێیان بۆ ئەوان پێنییە، بەڵکو ئەمانی کۆچەری رەشماڵنشین بۆشیان ئاسان نییە لەناو ئەو زەمینە جیاوازەدا هەڵبکەن. عەرەبەکان ترسێکی گەورەیان لەخانووبەرە هەبوو. تەنانەت کاتێك لەسەردەمی (عومەری کوڕی خەتتاب) لەکووفە لەجیاتی رەشماڵ، خانوو دروستکران، هەموویان سووتاندن. دواییش بەو مەرجە رێگا بەدروستکردنیان درا، کە لەسنووری خۆیان دەرنەچن، بچووك بن و بەرز نەکرێنەوە، کەچی لەشام خەڵك لەناو کۆشکی گەورە گەورەدا نیشتەجێ بوون. هەرچی شێوازی حوکم و بەڕێوەبردن لەسەردەمی ئومەوییدا خرابێتە کار، رۆمانی بووە، نەك عەرەبی. وەکو گوتمان تا سەردەمی (عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان)یش پارە بێزەنتی بوو. هێمای خاچی مەسیحیی و وێنەی ئیمپراتۆری بێزەنتیی بەسەرەوە بوو. تەنانەت ئیمپراتۆری بێزەنتی بەشێوەیەکی ناشیرین ناوی ئیسلام و پەیامبەری ئیسلامی لەسەر دیناری زێڕ نووسیبوو. بۆیە هەندێك هەتا ئێستاش پێیان وایە ئەو یاسایانەی رۆمانی دژی ئیسلام بوون و حوکمی ئومەوییەکان لەسەر بنەمای قورئان و



شەریعەتدا بەڕێوە نەچووە. بەکورتی کۆنتاکتی ئیسلام لەگەڵ هەندێك لەنەتەوەکانی دەرەوەی کورددا بەناچاری جۆرێك بووە لەئاڵۆێری کولتوری، کە ئەمڕۆ بە(acculturation) ناسراوە.

با نموونەی سێیەمیان بهێنینەوە، کە یۆنانە. ئەوان دوای چوار سەدە، شۆڕشی 1821 یان هەڵگیرساند و عوسمانییەکانیان لەوڵاتی خۆیان بەدەرنا. ئێمە دەبێت خۆشحاڵ بین، کە کورد نەیتوانیوە وەکو تورك و فارس بکات و وەکو ئەوان نەبۆتە خاوەنی میژوویەکی خۆێناوی، بەڵام خۆزگە دەمانتوانی وەکو یۆنان بکەین. لەو کاتەوە لەیۆنان کەسێك لەژێر ناوی ئاییندا ناچەوسێتەوە. ئەوە دوای ئەوەی تورکە موسڵمانەکان لەماوەی ئەو چوار سەدەیەدا سەدان هەزار منداڵ و پیریان لەوێ زیندەبەچاڵ کرد. لەوساوە هەموو موسڵمانێکیش لەوێ بەقەدەر کریستیانێك ئازادبووە لەدەربڕینی بیروباوەڕی خۆیدا. ئێمە بۆ نەمانتوانی نە وەکو تورك و فارس و نە وەکو یۆنان بکەین؟ بێگومان وەکو گوتمان لەبەر نەبوونی ئامادەیی ئەو کولتووره لەئاستی هەر پەلامارێکدا. کاتێك بەمێژووی ئەو سەردەمەدا دەچینەوە، دەبینین تورك و فارس لەپێناوی گرتنی دەستەڵات و فراوانکردنیدا هەموو رێگایەکیان گرتۆتە بەر. خەلافەتی عەباسی هەر جارێ بەدەست یەکێك لەوان بووە. ئەوان کاتێك دەگەیشتنە لووتکەی دەستەڵات و لەنزیکەوە کۆنتاکتیان لەگەڵ خەلیفەدا دەکرد، هەموو ئەو ترسانەیان دەشکان، کە بەپیرۆزیی خەلیفەوە بەند بوون. هەر زوو لەوە تێگەیشتن خەلیفە لەلایەن هێزێکی غەیبییەوە پارێزگاریی لێناکرێت. کاتێك کۆشکی نایاب و رازاوەی خەلیفەکانیان

دەبینی، کە پڕ بوون لەکەنیزە و کوڕی لووسکەی خەسێنراو و زۆربەشیان تورك و فارس بوون، بەئاسانی لەهەموو لوغز و نهێنییەکان تێدەگەیشتن. ئەوە لەکاتێکدا کورد لەدوورەوە هەتا هێزی تێدابوو لەرێگای فەنتازیای خۆیەوە وێنەی پاك و بێگەردی ئەو پیاوچاکانەی دەکێشا. ئەم تێگەیشتنە هەتا ئەمڕۆش درێژەی هەیە. سەیرەکە ئەوەیە ئەمڕۆ رۆشنبیری ئێمە مەسەلەکەی ئەوەندە سادە کردۆتەوە، کە شێوەیەکی تەواو کۆمیدیی بەخۆیەوە بینیوە. وەکو گوتمان ئەو هاتووە ئەو وێنەیەی هەلگێڕاوەتەوە. پاك و بێگەردییەکەی گۆڕیوە بۆ دزێو و ناشیرین. ئەو گەمەیە هێندە ئاسانە، کە هەموومان دەیزانین. تۆ ئازیزم دەپرسی ئەو هۆکارانە چین کە ئەنفال لەهۆشیارییەکی سیاسیی سادەوە، کە تەنها لەیادکردنەوەی سەرپێیانەی ساڵانەدا قەتیسبووە، دەگوازێتەوە بۆ هۆشیارییەکی کولتووری. بەڵام سەیرەکە لەوە دایە، ئەوە هەر رۆشنبیرە ئەنفالی وەکو دەیان مەسەلەی دیکە کردۆتە بۆنەیەکی سیاسی و لەنزمترین ئاستی زماندا یادی دەکاتەوە. کردوویەتیە عاشوورا و بەزنجیر دەکەوێتە گیانی خۆیەوە. ئەوە رۆشنبیرەکەمانە زۆر دیماگۆژییانە ئەو بۆنانە دەقۆزێتەوە و لەرێگایانەوە پێمان دەڵێت: "من ماوم، بەردەوامم". ئەو فێڵەی رۆشنبیر لەمەبەستێك زیاتری هەیە. لەلایەك بۆ فراوانکردنی سنوورەکانی ناوبانگی خۆیەتی و لەلایەکی دیکە دەیەوێت وامان تێبگەیەنێت، کە میدیاکان دەربڕینی راکانیان سنووردار کردووە، ئەگینا زۆر لەوە زیاتری پێیە. میدیاکان تیغی دوو سەر بوون بۆ رۆشنبیر. لەلایەك ناوبانگیان پێ بەخشی و لەلایەکی دیکە لەهەموو سەرچاوە



مەعریفییەکانیان دوورخستەوە. ئەنجام هەموو قسەکانی خۆی کرد، یان بەمانایەکی راستتر هەموو هەقایەتەکانی خۆی گێڕایەوە و ئێستا بەردەوام دەیانڵێتەوە. زۆربوونی تیڤی و رادیۆ و رۆژنامە و گۆڤارەکان وایکرد رۆشنبیر لەگۆشەگیرییەکەی خۆیەوە بێتە دەرەوە و رۆژانە بەبەرچاوومانەوە بێت. من دەزانم ئەم بابەتە دەبێت بەجیا لێیبکۆڵدرێتەوە، بەڵام لێرە تەنها ئەوەندەی لێی دەردەخەم، کە پێوەندیی بەئەنفالەوە هەیە. مەبەستمە بڵێم میدیاکان کاتێکیان بۆ رۆشنبیر نەهێشتۆتەوە تێیدا بخوێنێتەوە و لەناو تەنیاییەکانی خۆیدا بیر بکاتەوە، بەڵکو ئەم تیڤی بۆ ئەو رادیۆی دەنێرێت و ئەو رۆژنامە بەو گۆڤاری دەسپێرێت. ئەنجام کردوویانەتە کائینێکی میکانیکی، کە هەر دەڵێت و دەڵێت، کاتی بیرکردنەوەی نەماوە. هەتا ئەو رۆشنبیرە زیاتر هەقایەتەکانی خۆی دووبارە بکاتەوە، بەو ئەندازەیەش لای ئێمە زیاتر بێتواناییەکەی ئاشکرا دەبێت و کەمتر باوەڕمان پێی دەمێنێت. هەرچەند دەبینین ئەو رۆشنبیرە زۆر لەئێمە سادەتر دەدوێت، هیچ ئومێدێکمان نامێنێت، کە لەپشت ئەو سادەکارییەوە، پرۆژەیەکی گەورەی فیکریی رەخنەیی هەبێت. قسەکانی ئەو رۆشنبیرە میکانیکییە و سروودەکان کتومت لەیەکتر دەچن. هەردووکیان لەبۆنەکان لێدەدرێن و گۆڕانیان بەسەردا نایەت. ئەو رۆشنبیرە وا بۆ بیست ساڵ دەچێت لەبارەی ئەنفالەوە دەڵێت و هیچ گۆڕانکارییەکی نەهێناوەتە کایەوە، کەچی نەك هەر گومان لەتوانای خۆی ناکات، بەڵکو وەکو پێی راهاتووە کۆمەڵێك گلەییش لەخەڵك دەکات، بەوەی ناگۆڕێن. ئەنفال، کە یەکێکە لەمەسەلە

ئالۆزەکانی ناو فیکری ئیسلامی، ناکرێت ئێمە باوەڕ بکەین، کە لەرێگای قسە سادەکانی رۆژانەی رۆشنبیرەوە دەتوانین لێی تێبگەین. ئەو رۆشنبیرە خۆی پێویستی بەوە هەیە تێبگات، کە ئەو هەقایەتانەی ئەو دەیانگێڕیتەوە، نەك لەتوانایاندا نییە هیچ فیکرێك بەرهەمبهێنن، بەڵکو هەر خۆیان دەبنە بەشێکی دیکەی ئەدەبی زارەکی و دەبێت لەناو ئەو ئەدەبە زارەکییەدا راڤە بکرێن. ئەگەر ئەمڕۆ کێشەی گەورە لای عەرەب ئەوەیە، کە دەستەوستانن لەوەی فیکری خۆیان لەکەلەپوورەوە بۆ تازەگەری بگوازنەوە، ئەوا لای ئێمە وەك دەبینین کێشەکە زۆر لەدوای ئەوەوەیە. هەتا ئێستا رۆشنبیر دڵنیای نەکردووین، کە بیر دەکاتەوە، بۆیە ئەرکی ئێمە زۆر قورسە. دەبێت ئێمە رۆشنبیر بەئاگابێنینەوە و دنیای بۆ رۆشنبکەینەوە، هەتا ئەو رادەیەی، کە دەتوانێت هۆشیارمان بکاتەوە و ئەنفالیش لەهۆشیارییەکی سیاسیی سادەوە، کە تەنها لەیادکردنەوەی سەرپێیانەی سالانەدا قەتیسبووە، بگوازێتەوە بۆ هۆشیارییەکی کولتووری. ئەگەر ئەو دیمەنە زۆر بەشێوەیەکی گاڵتەجاریانە دێتە بەرچاو، ئەوا رۆشنبیر خۆی بەسەر خۆیدا هێناوە. رۆشنبیر تا ئەو کاتەی پێناسەی خۆی وەکو رۆشنبیر دەرناخات، هیچ سەرزەنشت ناکرێت، کە بۆچی نەیتوانیوە ئەنفال بکاتە هۆشیارییەکی کولتووری، بەڵام کاتێك خۆی لەرێگای ئەو پێناسەیەوە نیشان دەدات، ئەوا بەرپرسیارێتیی ئەو دۆخەی دەکەوێتە ئەستۆ. میدیاکانیش بێگوناه نیین، کە بۆ بەجۆشدانی گفتوگۆ و بۆ گەرمکردنی بازاڕ، کۆمەڵێك ئاوەڵناوی قەبە دەخەنە پاڵ ناوی ئەو رۆشنبیرەوە.



**پرسیار**: تۆ یەکێکی لەو نووسەرانەی، کە تا ئێستا لەو چەند گفتوگۆیەی لەگەڵیاندا ئەنجامداوی، پرسیاری پەیوەندیی نێوان ئەدەب و ئەنفالت ئاڕاستە کراوە. لەسەرجەمیاندا باوەڕت وابووە ئەوەی لەو پەیوەندییەدا سوودمەند نەبووە ئەدەبە. ئایا پێت وایە شکستی نووسەری ئێمە لەبواری فیکر بەتایبەتییش لەمەسەلەی ئەنفالدا هەمان شکستە لەبواری ئەدەبیشدا؟

**کاروان عومەر کاکەسوور**: لای ئێمە چارەنووسی ئەدەب و فیکر یەکێکە، چونکە هەموو ئەوانەی نووسەری ئەدەبیین، هاوکات خەریکی کاری فیکرییشن. ئەگەرچی لەدەرەوەی ئێمە ئەو دوو کایەیە کەم و زۆر سەربەخۆن، بەڵام بەداخەوە لای ئێمە هەمان شتن. ئەمە بەپلەی یەکەم ناتێگەیشتنێکە لەئەدەب، چونکە هەتا ئێستا نووسەری ئەدەبی نەیتوانیوە باوەڕبهێنێت، کە چیرۆك، رۆمان، شیعر، هونەری شێوەکاری و هونەرەکانی دیکە لەتوانایاندا هەیە فیکر بەرهەمبهێنن، بۆیە بەختی خۆی لەزۆر بواری دیکەش تاقیدەکاتەوە. کەم نیین ئەو نووسەرە ئەدەبییانەی لەپێش فەیلەسووفەکانەوە نەك پێشبینیی ئایندەیان کردووە، بەڵکو لێکدانەوەی وردیشیان بۆ ئەو ئایندەیە کردووە. بۆ ئەوەی زۆر دوورنەکەوینەوە، لەجیاتی نووسەرانی وەکو (کافکا) و (ڕیلکە)، (شێرکۆ بێکەس) بەنموونە دەهێنینەوە، کە تا ئێستا من هیچ نووسینێکی ئەو شاعیرەم لەبارەی ئەنفالەوە نەبینیوە، بەڵام لەرێگای هەندێك لەشیعرەکانیەوە زۆر زۆر لەو نووسەرانەی زیاتر مانا بەرهەمهێناوە، کە

هەموو مێژووی نووسینی خۆیان لەسەر ئەو چەمکە دامەزراندووە. هەمان شت لای (قوبادی جەلیزادە) و (بەرزان هەستیار) و (دڵشاد عەبدوڵلا)دا هەستپێدەکەین. تابلۆکانی (شەماڵ عادیل سەلیم) و (ڕێبوار سەعید) چەند دنیایەکی سەربەخۆن، کە لەهەر یەکێکیاندا نهێنییەکانی ئەنفال بەجیاواز لەویتر دەردەکەون.

بەڵێ، من لەهەموو گفتوگۆکانمدا لەوانە لەگەڵ (توانا ئەمین)، (ئیدریس عەلی)، (سایتی دەنگەکان) و (نەورۆز عەلی) و یەك دوو نووسەری دیکەشدا پێم لەسەر ئەوە داگرتوە، کە ئەنفال دۆستایەتییەکی بەتینی لەنێوان نووسەر و مێژوودا دامەزراندووە. لەوەڵامی پرسیاری (دەنگەکان)دا گوتوومە: "پێموایە بەهەڵەدا دەچین کاتێك دەمانەوێت ئەنفال و هەر ڕووداوێکی دیکەی مێژوویی و مرۆیی لەخەیاڵ و فانتازیا دابڕین. ئەنفال پێش ئەوەی بکرێتە تێکست، واقیع بوو. پێش ئەوەی بکرێتە تێکستیش، خەیاڵ بوو. کاتێك خەیاڵ و ئایدۆلۆژیا ئاوێتە دەبن، ڕووداوی وەکو ئەنفال دەهێننە کایەوە".

ئەگەرچی خەیاڵ و واقیع بەیەك خێرایی و بەیەك ئاڕاستە ناچنە پێشێ، کەچی نووسەری ئێمە هەر کاتێك هەستی کردووە گۆڕانێك لەواقیعدا ڕوویداوە، هەوڵی داوە ئەدەب لەگەڵ ئەو واقیعەدا ڕێکبخات. ئەدەب خۆی لەو نێوەدا بێلایەن نەبووە، بەڵکو پەیامێکی پاك و بێگەردی پێبووە. ویستوویەتی هەموو ناشیرین و گڵاوەکان دەستنیشان بکات، کە ئەمەیان ئەرکێکی ئایدۆلۆژییە. لێرەدا ئەدەب بەوەی ئەرکێکی پیرۆزی لەئەستۆیە، ناکەوێتە ژێر ڕکێفی هیچ گومان و ڕەخنەیەکەوە، بەڵکو ئامێرێکی



پێرفێکتە بۆ دۆزینەوەی هەموو خراپەکارییەکان لەبەرەی دژدا. نووسەری ئەو ئەدەبە وەکو جەنگاوەرێکی ڕێگای ڕاستی خۆی دەرخستووە، بۆیە لەگەڵ دەرکەوتنی ئەو شێوازە نووسینە، ڕەخنە دەستی لەهەموو شەڕ و ئازاردانێکی تێکست هەڵگرتووە. دیارە تۆ دەزانی مەبەستم ئەو شەڕەجنێوە نییە، کە هەتا ئێستاش لای ئێمە وەکو ڕەخنە سەیری کراوە. دەتوانین بڵێین لەدوای ڕاپەڕینەوە جۆرێك ڕێککەوتنی نهێنی لەنێوان ئەو ئەدەبە و ڕەخنەدا هاتۆتە گۆڕێ، بەوەی شەڕ بەیەکتر نەفرۆشن. بەردەوام هەر یەکەیان ئەویدیکەیان زیندوو دەکاتەوە، بۆیە ستایلی ئەو نووسەرە هیچ گۆڕانێکی بەسەردا نایەت. ئەوەی دەگۆڕێت، چۆنایەتی نییە، بەڵکو چەندایەتییە. بەکارهێنانەوەی بەکارهێنراوە. بۆیە ئەنفالیش وەکو زۆر ڕووداوی دیکەی مێژوویی نابێتە ئەدەب و هەر بەبەرچاومانەوە دەمێنێتەوە. بەمانایەکی دیکە ئەو ئەدەبە نەك هەر نەیتوانیوە ئەو تراژیدیایەمان لەبیر بباتەوە، بەوەی کۆمەڵێ مانای دیکەی جوانکاری و هونەریی پێبەخشێت، جیاواز لەو مانایانەی واقیع پێی بەخشیوە، بەڵکو نووسەرانی ئەو ئەدەبە هەمان مانا زانراوەکانی واقیع بەکاردەهێننەوە و لەبۆنە نیشتیمانییەکانیشدا داوا دەکەن شەرممان بشکێت و زۆر لەوەش ڕوونتر و زیاتر ئاوڕ لەئەنفال بدەینەوە. من دەکرێت لێرەدا هەمان ئەو گوتەیە بڵێمەوە، کە پێشتر بە(سایتی دەنگەکان)م گوتووە، ئەویش ئەوەیە، کە "ئەوەی ناهێڵێت ئەنفال و هەر ڕووداوێکی دیکەی مێژوویی بسوێتەوە، ئەو وتار و لێکۆڵینەوانەن، کە لەگۆڤار و ڕۆژنامەکاندا بڵاودەکرێنەوە و باس لەگەورەیی ئەو تێکستانە دەکەن".

ڕەخنەی حەفتاکان و هەشتاکان بەو هەموو سادەیی و ساکارییەی خۆیانەوە جۆرێك ناتەباییان لەگەڵ تێکستدا دەردەخست، بەڵام لەنەوەدەکانەوە ئەو دوانە پەیمانی ئاشتییان مۆر کردووە و سەرپێچی لەبەندەکانی ئەو پەیمانەش ناکەن. هاوکات بیرمان نەچێت ئەو ئەدەبەی حەفتاکان و هەشتاکانیش جۆرێك دژایەتییان لەگەڵ واقیعی خۆیاندا دەهێنایە گۆڕێ. لەپرسیارێکی (ئیدریس عەلی) لەگۆڤاری "ئایندە"دا لەوە دواوم. (دووربین)ی (محەمەد فەریق حەسەن) نموونەیەکی زۆر دیاری ئەدەبی ئەو سەردەمەیە، کە مامەڵەیەکی هونەرییانە و ئیستاتیکییانەی بێوێنەی لەگەڵ واقیعدا کردووە. هەر لەبەر ئەوەشە لەگەڵ بەسەرچوونی واقیعی واقیعەکەشدا، بەڵام واقیعی چیرۆکەکە هێشتا هەر ماوە، چونکە چیرۆکنووس واقیعێکی جیاوازتر و گەورەتری لەواقیعی واقیع خولقاندووە. دەتوانین بڵێین ئەدەبی ئێمە لەنەوەدەکانەوە بە(محەمەد فەریق حەسەن) خۆشیەوە دژایەتیی لەگەڵ واقیعدا دروستنەکردووە و رەخنەش لەگەڵ هیچیان. ناڵێم هیچ تێکستێکی جیاوازمان نییە، بەڵام ئەوەیان باڵادەستە. ئەو ستایلە لەئەدەبی ئەنفال بەگشتی و لەچیرۆك و رۆمانەکانیدا بەتایبەتی زۆر زەق دەردەکەوێت. نووسەر و نارەتەر، کە خۆیان دوو دەنگی سەربەخۆن و هەمیشەش بەسەربەخۆیی کار دەکەن، کەچی لای ئێمە هەردووکیان دەبنە یەك دەنگ و لایەنگری بێچەندوچوونی کارەکتەری سەرەکیی و هەموو ئەو کارەکتەرانەی دیکەشن، کە دەکەونە بەرەی کارەکتەری سەرەکییەوە. ئەنجام هەر سێ دەنگە جیاواز و سەربەخۆکە دەبنە یەك. لێرەوەیە خەیاڵ بەتەواوی دەکەوێتە ژێر



دەستەڵاتی واقیعەوە. هەر ئەمە ئاسانکارییەکی گەورە بۆ نووسەر فەراهەم دەکات، بەوەی واقیع لەرێگای زمانی خۆیەوە زۆر ئۆتۆماتیکییانە هەموو رووداوە زانراوەکانی خۆی بەنووسەر دەبەخشێت و گێڕانەوەکەشی بۆ مسۆگەر دەکات. ئەو کارەکتەرە لەبەرانبەر دەستەڵاتەکانی باوکی ماڵ و باوکی قوتابخانە و باوکەکانی دیکەدا زۆر بیگوناە نیشاندەدرێت و لەنزمترین ئاستی زماندا خەمەکانی خۆیمان بۆ هەڵدەڕێژێت. بیۆگرافیای ئەو کارەکتەرە هەمان مێژووی نەتەوەکەیەتی، کە تەنها چەوساوەتەوە و دوورە لەهەموو خراپەکارییەك. هیچ یەکێ لەو گوناهانە ناکەونە ئەستۆی خۆیەوە. بەمانایەکی دیکە نووسەر لەرێگای زمانەوە کارەکتەر لەناو خەیاڵدا ناخولقێنێت، بەڵکو سووك و ئاسان لەناو مێژووی زارەکییدا دەیگوازێتەوە. لێرەوەیە ئەو کارەکتەرە هەر لەسەرەتاوە مەحکومە بەوەی ملکەچی واقیعێکی دیاریکراو بێت، کە پێشتر لەسەرچاوەکانی راگەیاندنەوە ئێمە چارەنووسەکەیمان بۆ ئاشکرا بووە. بۆ نموونە ئێمە هەرکە لەچەند لاپەڕەی یەکەمدا فڕۆکەکان دەبینین، دەزانین ئەوانە گازی کیمیاوی دەڕشێنن. ئەو زیلە سەربازییانە خەڵکی بێتاوانیان تێدەکرێن و بەرەو شوێنێکی نادیار دەبردرێن. هەموو کەرەسەکانی ئەو نووسەرە کاریان پێدەکات، ئاشکران و هەموو جووڵەیەکیشیان لەژێر رکێفی مێژوویەکی زانراو دایە. ئەوەی نەیهێشتووە ئەو ئەدەبە وەکو ئەدەبی شاخ و ئەدەبی سەردەمی شۆڕشی چەکداری لەناو ئایدۆلۆژیادا بخوێندرێتەوە، ئەوەیە، کە نووسەرانی ئەو ئەدەبە زۆر دیماگۆژییانە بۆ گۆڤار و تیڤییەکان دەدوێن. بەهەندێك زاراوەی قەبە قەبەی وەکو

باوکسالاری و سیکۆلاریزم و نامووسپەرستی و شتی دیکە چاوبەستمان دەکەن.

نووسەری ئێمە کاتێك دێت لەناو ئەدەبی زارەکییەوە باس لەئەنفال دەکات، ئەوا خەیاڵی ئەو نووسەرە پێش ئەوەی بکەوێتە کار، دیاریکراوە. ئاڕاستەکانی نیشانکراون. لێرەشدا بۆ خوێندنەوەی ئەو ئەدەبە پرینسیپەکانی واقیع کراونەتە مەحەك. هەتا ئەو ئەدەبە زیاتر واقیعی بەرجەستە کردبێتەوە، ئەوەندە لای ئەو خوێندنەوەیە بایەخی پەیدا کردووە و زیاتر پەسەند کراوە. بەهەمان ئەندازەش گومان لەسەر پیرۆزیی ئەو تێکستانە کەمتر و کەمتر بوونەتەوە. بمانەوێت و نەمانەوێت ئەو ئەدەبە بەحوکمی ئەوەی یادەوەریی کۆی ئێمەی بەرجەستە کردووە، خاوەنی خوێنەری خۆیەتی و لەبازاڕی چاپەمەنییش ڕەواجی هەیە. هەر ئەو ڕەواجەش، کە دوور و نزیك پەیوەندیی بەقووڵیی ئەو ئەدەبەوە نییە، جۆرێك دەستەڵاتی بەرهەمهێناوە. بەکورتی ئەو ئەدەبە نەك زیاترین هەوڵی داوە پیرۆزیی بەرهەمبهێنێت، بەڵکو دواجار هەر خۆی ویستوویەتی ببێتە پیرۆز بەرانبەر بەگڵاو. ئەو ئەدەبە هەرچەند هەوڵی دابێت فریومان بدات، بەوەی گوایە سەربەخۆ لەئایدۆلۆژیا هەڵدەسووڕێت، بەڵام لەوەدا لەگەڵ ئایدۆلۆژیا تێکدەکاتەوە، کاتێك ئەویش وەکو ئایدۆلۆژیا بەرەو (ڕای گشتی) ئاڕاستە دەکرێت. ئەوەی ئێمە بەناوی ڕەخنە لەدوای ڕاپەڕینەوە خوێندوومانەتەوە و بەزمانێکی سادە و ڕەوان بەشان و باڵای ئەو نوسەرەیاندا هەڵداوە، بەشی هەر زۆریان (ڕای گشتی)ین. ئەگەر گوتاری ئەنفال پیرۆزیی خۆی لەناو ئاین و مێژووی ئایندا بەدەستهێنابێت،



ئەوا ئەو ئەدەبە بەشێوەیەکی دیکە پیرۆزیی خۆی لەناو ئەو (ڕای گشتی)یەدا بەدەستهێناوە. ئەو گوتارە ناڕاستەوخۆ پێمان دەڵێت هەڵوەشاندنەوەم، سەرکوتکردنی دەنگی نەتەوەیەکی بریندار ئەنفالکراوە. وەك هاوکات پێمان بڵێت مانەوە و پیرۆزڕاگرتنم، ئەرکێکی نەتەوەیی و نیشتیمانییە. لێرەوەیە ئێمە ڕووبەڕووی هێزێکی دیکەی پیرۆزیی دەبینەوە. وەکو (پیر بۆردیۆ) باوەڕی وایە (ڕای گشتی) لەلایەن ئایدۆلۆژیاوە بەمەبەستی بەدەستهێنانی ڕەوایەتی پشتی پێدەبەسترێت. ئەو ئەدەبە زیاتر لەسەر ئاستی میللییدا خوێندراوەتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو خوێندنەوەیە بەمەبەستی فریودان پەنای بۆ بەکارهێنانەوەی چەمکە ڕەخنەییەکان بردووە، بەڵام بەهیچ شێوەیەك نەیتوانیوە ئەو بەرگە میللییەی خۆی بشارێتەوە، چونکە لەلایەك بەسادەیی کاری کردووە و لەلایەکی دیکە هەر لەسەرەتاوە تەباییی خۆی لەگەڵ ئەو تێکستەدا نیشان داوە. پێش هەموو ئەوانەش ئەو تێکستەی مەبەستی بووە ئیشی لەسەر بکات، هەڵگری هیچ نهێنییەك نییە و ناتوانێت هیچ کۆنتاکتێك لەگەڵ ڕەخنەدا بکات. ئەو خوێندنەوانە ڕۆڵی کۆمەڵێك پاسەوان دەبینن لەدەوری ئەو تێکستانەدا. هەتا ژمارەی ئەو پاسەوانانە زۆرتر بن، دەستەڵاتی ئەو تێکستانە گەورەتر دەبن و لەئاستی ڕەخنەی جدییدا زیاتر بەرگریی لەمانەوەی خۆیان دەکەن. هەر ڕەخنەیەك لەو تێکستانە، مانای بەگژداچوونەوەی (ڕای گشتی)یە و خۆی لەتەنیایی و لەبەرەی کەمایەتییدا دەبینێتەوە. لێرەوەیە بەشێوەیەك لەشێوەکان ئەدەب لای ئێمە لەجیاتی تواناکانی خۆی لەئاستەکانی هونەر و ئیستاتیکادا

وەربگرێت، لەهێزە كۆمەڵایەتییەكانی وەردەگرێت. بۆیە نووسینی ئێمە ئەوەندەی ئاوەڵناو بەرهەمدەهێنێت، چارەكی ئەوە رۆشنبیریی بەرهەم ناهێنیت. ئەو ئاوەڵناوانەش دەبنە سەرمایەیەكی رەمزی و خاوەنەكانیان لەهەموو رەخنەیەك بەدوور دەگرن. ئاسان نییە بەنووسەرێكی بەناوبانگ بڵێی رۆمانەكەی، یان شیعرەكەی لاوازە. یان بڵێی ئەو نووسەرە بەناوبانگە هیچ لەچەمكی ئەنفال تێنەگەیشتووە، مادام ئەو رۆمانەی یان شیعرەكەی ژمارەیەكی زۆر نووسەر لەبارەیانەوە نووسیوە. ئەو دەستەڵاتە بەردەوام كۆمەڵێك تێكستی داهێنەرانە سەركوت دەكات تەنها لەبەرئەوەی بەو ئاراستەیەی واقیع كاریان نەكردووە. كاتێك ژمارەی خوێندنەوەكان دەكرێنە مەحەك بۆ گەورەیی و بچووكیی تێكستەكان، تەنها هەندێك ئاوەڵناوی وەكو "نووسەری گەورە" و "رووناكبیری بەتوانا" و "داهێنەری بەناوبانگ" و شتی دیكەی لەو بابەتە بەدەستەوە دێن، بەڵام هەر ئەو پیاوە مەزنانە ناتوانن بەقەدەر خوێنەرێكی زۆر ئاسایی فیكر بەرهەمبهێنن. بۆ نموونە نووسەرمان هەیە هەموو ئەدەبەكەی خۆی لەسەر ئەنفال و رووداوە زەقەكانی دیكەی مێژوو دامەزراندووە، كەچی كاتێك دەم دەكاتەوە، دەبینی ئەو هەر لەبنەڕەتەوە نەیزانیوە ئەنفال چییە و مێژوو چییە. تا ئێستاش ئەو نووسەرە وایزانیوە ئەدەبی ئەنفال ئەوەیە، كە وشەی ئەنفالی تێدا بەكار هاتووە، بۆیە كۆمەڵێك ناوت بۆ ریز دەكات و پێت دەڵێت ئەوانەن نووسەرانی ئەنفال.

# ڕێبین هەردی



**هیچ كارەساتێك گرنگی پێنادرێت گەر ئەو نەتەوەیەی كە كارەساتەكەی بەسەردا هاتووە خۆی گرنگی پێنەدات. ئێمە دەبێ بەر لەهەركەس لەخۆمان بپرسین ئایا لەبەرامبەر ئەنفالدا بێدەنگ نەبووین؟ ئایا هەستمان بەقوڵایی ئەو كارەساتە كردووە؟ بەرلەوەی بەرۆكی خەڵكی دی و لایەنی دی بگرین، نابێت لەخۆمان بپرسین ئەی ئێمە چیمان بۆ ئەنفال كردووە؟**

ڕێبین هەردی



**پرسیار:** ئەگەر بهاتایە ئەنفال لەوڵاتێكی ئیسلامیدا روویندەدایەو هەروەها مانایەكی ئیسلامیشی پێنەدرایە، پێتانوابوو ئەنفال بتوانرایە نوقمی بێدەنگییەكی وابكرێت، هەم لەلایان وڵاتانی دراوسێوە تا دەگاتە هەموو وڵاتە ئیسلامییەكانی دنیا، ئەوسا وڵاتانی ئەوروپاش؟

**ڕێبین هەردی:** گەلێك كارەسات لەناو كۆمەڵگا ئیسلامیەكاندا رویداوەو لەگەڵ ئەوەشدا توانراوە رەهەندێكی جیهانیی پێبدرێت. هەر لەم مێژووەی ئێستادا قڕكردنی ئەرمەنەكان لەلایەن عوسمانییەكانەوە گرنگییەكی جیهانی وەرگرتووە. ئەوەی لەدارفۆردا روودەدات بووە بەشتێكی جیهانیی و بەردەوام بەشێكی گرنگی سەردێڕی هەواڵەكانی داگیركردووە.

تاوانكردن بەناوی دینەوە شتێكی تازە نییەو هیچكاتێكیش ئەم ناوە نەیتوانیووە سەرپۆشێك بۆ تاوانەكە دروستبكات. تاوانەكە چ پەیوەندییەكی بەدینەوە نییە تا رێگربێت لەناساندنی وەك تاوانێك. ئەم قسەیە لەكاتێكدا راست دەبوو كە خەڵكی بڕوایان بەوەكردبێت چ لەشكری بەعس لەشكرێكی دینییەو چ كوردەكانیش كافرن. وەلحاڵ جگە لەشۆفێنستە عەرەبەكان كەسێك نییە گومان لەموسڵمانبوونی كورد بكات تا ئەوەی قبوڵبێت كە ئەنفال هێرشێكی دینییەو دەبێت پشتگیری لێبكرێت.

زیاد لەهۆیەك هەیە وایكردووە ئەنفال چ لەكاتی روودانی و چ دوای روودانیشی ئەو كاردانەوەیە دروستنەكات كە لەئاستی قەبارەی

کارەساتەکەدا بێت: ئەوەمان لەیادبێت ئەنفال لەکاتێکدا روویدا کە بەعس لەهەرە بەهێزترین کاتەکانی خۆیدا بوو. بەعس وڵاتێکی وا شاراوەو دوور لەڕاگەیاندن و هەواڵی دروستکردبوو، کەتەنانەت شارەکانی عێراقیش هەواڵی شارێکی دییان نەدەزانی. عێراق بۆ زۆر کەس وڵاتێکی داخراو و نەزانراو و نەناسراو بوو. ئەو سەردەمە هێشتا ئەم لێشاوی گۆڕانە خێرایەی لەتەکنەلۆژیای پەیوەندیدا رویدابوو، ئەم ناوچەیەی نەگرتبۆوە. نەتۆڕەکانی ئەنتەرنێت و نەکەناڵە ئاسمانییەکان بەو شێوەیە بڵاونەبووبوونەوە. وێنەی ئەنفال نەگیراو لەدۆخێکدا روویدا کە ناوچەکە ئەم تەوژمی فرەیی ئامێرەکانی پەیوەندی بەخۆیەوە نەبینی بوو. لەیادمان بێت تەنانەت لەعێراقی بەعسدا ئامێری تایپ بەیەکێك لەشتە قەدەغەکان دەزانراو لەهەر ماڵێکدا ئەم ئامێرە بگیرایە، ماڵەکە تووشی زیندانیی و ئەشکەنجەی جۆراوجۆر دەبوون. بەعس سیاسەتێکی راگەیاندنی پەیڕەو دەکرد کە جگە لەدەنگی خۆی و هەواڵەکانی خۆی، رێگەی بەدزەکردنی هەواڵێکی راستەقینەی وڵات نەدەدا. بەگشتیی دەمەوێت بڵێم راستی بەهۆی سیاسەتی داخراوی بەعسەوە بۆجیهانی دەرەوە نەزانراو بوو. تەنانەت رۆشنبیرێکی وەك ئیدوارد سەعید سەرەتا کۆی ئەو قسانەی لەسەر تاوانەکانی بەعس دەکرا بەناڕاست دەزانی و تەنها پاش رووخانی رژێم و دەرکەوتنی گۆڕە بەکۆمەڵەکان دانی بەوەدا نا کە لەمبارەیەوە هەڵەی کردووەو ئەو راستیانەی نەزانیوە.

ئەمە جگە لەوەی بەعس لەکاتێکدا تاوانی ئەنفالی ئەنجامدا کە زووربەی وڵاتە رۆژئاواییەکان و تەنانەت دەوڵەتە ئیسلامیەکان، ئێران و



راگرتنی ئەو تەوژمە شۆڕشگێڕانەیەی لەشۆڕشی ئێرانەوە دەیویست پەل بۆ دەوروبەری بهاوێژێت، بەمەترسی یەکەم دەزانی و بەعسیشیان وەك بەربەستێك لەبەردەم ئەم تەوژمەدا تەماشا دەکرد. ئەم هەلومەرجە سیاسییە وایکردبوو زووربەی دەوڵەتەکانی ناوچەکەو رۆژئاوا گوێیان لەو راگەیاندنانە نەبێت کە بزووتنەوە نەیارەکانی بەعس لەملاولا پەخشیاندەکرد.

بەڵام پاش رووخانی رژێم و ئاشکرابوونی تاوانەکانی، ئەم هاوکێشەیە گۆڕا. هەر ئەوەندە بەسە بڵێین کێ دادگایی تاونبارانی ئەنفالی کردو توندترین سزای بەسەردا دان؟ دادگای عێراقی بەدادوەرە عەرەب و داواکاری گشتیی عەرەبە موسڵمانەکانی عێراقەوە نەبوو کە حوکمی لەسێدارەدانی بۆ تاوانبارانی ئەنفال دەرکرد؟ کەوابوو ئەو قسەیە بەوردبین نابینم کە بێدەنگی لەئەنفال و ئەو گرنگیپێنەدانە، هۆکاری دیینی لەپشتەوە بێت.

تەماشاکە ! هیچ کارەساتێك گرنگی پێنادرێت گەر ئەو نەتەوەیەی کە کارەساتەکەی بەسەردا هاتووە خۆی گرنگی پێنەدات. ئێمە دەبێ بەر لەهەرکەس لەخۆمان بپرسین ئایا لەبەرامبەر ئەنفالدا بێدەنگ نەبووین؟ ئایا هەستمان بەقوڵایی ئەو کارەساتە کردووە؟ بەرلەوەی بەرۆکی خەڵکی دی و لایەنی دی بگرین، نابێت لەخۆمان بپرسین ئەی ئێمە چیمان بۆ ئەنفال کردووە؟ ئایا ئەرکی کێیە ئەنفال بکاتە بەشێك لەیادەوەری جیهانیی..کورد خۆی یان گەلانی دی؟ ئایا بەڕاست ئەنفال بەشێك لەیادەوەری ئێمەی دروستکردووە؟ دوو دەیە بەسەر ئەنفالدا دەڕوات و

تائێستاش ئێمە سەرژمێرییەکی کوژراوەکانمان لانییە. لەدوای کەوتنی سەدامیشەوە هەولێکی ئەوتۆمان بۆ دۆزینەوەی گۆڕە بەکۆمەڵەکانیان نەداوە..بگرە لەدادگای ئەنفالدا کە بۆ یەکەمجارە قوربانییەکان قسە دەکەن، هەولێکمان بۆ تۆمارکردنی ئەو ئازارو ئەشکەنجانە نەداوە کە قوربانییەکانی ئەنفال بەزمانی خۆیان دەیانگێڕایەوە.

**پرسیار:** ئەو هۆکارانە چین کە ئەنفال لەهۆشیارییەکی سیاسیی سادەوە کە تەنها لەیادکردنەوەی سەرپێیانەی ساڵانەدا قەتیسبووە دەگوازێتەوە بۆهۆشیارییەکی کەلتووریی، لەو بێدەنگییەی کە خاوەنی قسەنییە دەگوازێتەوە بۆ بیرکردنەوەیەك بەدەنگی بەرز؟

هەروەها ئەم بێدەنگییە چەند پەیوەندی بەکورد خۆیەوە هەیە، هەم لەئاستی بەرپرسیارییەتی کۆمەڵگای کوردی بۆ ئەنفال و هەم لەئاستی دەسەڵاتی کوردی خۆیدا؟

**ڕێبین هەردی:** لەو کەسانەم بڕوام بەوە نییە هۆی بێدەنگبوون لەئەنفال دەگەڕێتەوە بۆئەوەی کوردەکان خۆیان بەشێوەی جیاواز بەشدارییان لەپرۆسەی ئەنفالدا کردووە. هەمیشەو هەموو کات و لەهەموو کۆمەڵگایەکدا کەسانێك هەن کە هاوکاری تاوانی ڕژێمە سیاسییەکانیان کردووەو هەرگیزیش ئەم بەشدارییە نەبۆتە هۆی ئەوەی خەڵکی لەو تاوانانە بێدەنگ بێت. بگرە پێموایە ئەمجۆرە بەشدارییەیە رووی دڕندانەو ترسناکی کارەساتەکە دەردەخات. ترسناکترین کارەساتەکان ئەو



کارەساتانەن کە ڕژێمە دیکتاتۆرو دڵڕەقەکان خەڵکی ناچاردەکەن دژی خۆیان جەنگ بکەن. کارەسات ئەوکاتە قوڵتر دەردەکەوێت کە ڕژێمەکان هێندە توقێنەرو ترسناکن کە خەڵك ناچاردەکەن کەسوکارو هاوڕێ و هاوڵاتیانی خۆیان بکوژن.

کەوابوو مەسەلەکە پەیوەندی بەم لایەنەوە نییە. دەبێت پرسیارەکە بەشێوەیەکی دی بکەین، کە ئەویش ئەوەیە چ کاتێك کارەساتێك وەك کارەسات لەبەردەم کۆمەڵگایەکدا ئامادە دەبێت و بەشێکی گرنگ لەهوشیاری ئەخلاقیی و سیاسیی و کۆمەڵایەتی پێکدەهێنێت. لەچ کاتێکدا کارەساتێکی وەك ئەنفال بەشداری لەدروستکردنی خەیاڵ و هوشیاری مرۆڤی ئێمەدا دەکات؟. سەرەتاترین وەڵام ئەوەیە، هیچ کاتێك کارەساتێك وەك کارەسات نابینرێت گەر ئەو کارەساتە نەبوو بێت بەبەشێك لەڕابردوو. من چەندانجار لەشوێنێکی دیدا گوتوومە ئەوەی کارەساتێك دروستدەکات و دەیکاتە بەشێك لەزاکیرەی مرۆڤی ئێمە خودی ڕووداوەکە نییە، بەڵکو ئەو گێڕاناوانەیە کە لەڕووداوەکەوە پێماندەگات. بەسەرهاتی ئەوکەسانەیە کە لەکارەساتەکەدا ژیان و تاڵی و ناخۆشییەکانیان بینی. بەڵام ئەمەش هەموو شتێك نییە، بەڵکو لەگەڵ ئەمەشدا دەبێت ئارەزووی بیستنێك هەبێت کە لەگەڵ گێڕانەوەکاندا بژی و توانای بیستنی هەبێت. هیچ یەك لەمانەش ڕوونادات گەر خودی کارەساتەکە نەبووبێتە بەشێك لەڕابردوو. کارەساتێکیش نابێتە بەشێك لەڕابردوو گەر ئەو کۆمەڵگایە دۆخی کارەساتاوی بەجێنەهێشتبێت و لایەنیکەمی بەئارامیی و هێمنی نەژی.

لەدوای راپەڕینەوە کۆمەڵگای ئێمە دۆخی کارەساتی بەجێنەهێشت. لەلایەك هێشتا سەدام حسێن و رژێمی بەعس لەسەرکاربوون و هەرجارەو هەڕەشەی جۆراوجۆریان لەکوردستان دەکردو بەمەش خەڵك هەمیشە لەدۆخێکی دڵەڕاوکێدا دەژیان، لەلایەکی دیشەوەو پاش ماوەیەك شەڕی ناوخۆ هەڵگیرسا، بەهەموو ئەو برینە قوڵانەوە کە بەجێیهێشت. ئەم دۆخە وایکرد کوردستان و هاوڵاتیانی کوردستان هەرگیز ئەو دۆخی ئارامییە نەژین کە بتوانن ئاوڕ لەڕابردوو بدەنەوەو بزانن چی تیا روویداوە. مرۆڤ توانای ئاوڕدانەوەی لەڕابردوو نابێت، گەر لەئێستاو داهاتووی دڵنیا نەبێت. دەمەوێت بڵێم تەنها کاتێك دەتوانین هەست بەو میحنەت و کارەسات و تاوانانە بکەین کە خەڵکی لەڕابردوودا تیای ژیاون کە خۆمان ئەو دۆخەمان بەجێهێشتبێت. ژیانێکی ئاسودەو دوور لەدڵەڕاوکێ بژین کە تیاییدا بەڕاستی هەست بەلەزەتی ژیان بکەین. بەبێهەستکردن بەلەزەتی ژیان، ئەستەمە لەمیحنەتی ئەو کەسانە تێبگەین کە لێی مەحرومکران. وەلحاڵ لەکوردستانی دوای راپەڕیندا ئەم دۆخە ئارام و ئاسودەیە هێشتا بەدەست نەهاتووە.

بەدەربڕینێکی دی وەك لەشوێنێکی دیدا گوتوومە ئەنفال هێشتا رووداوێکە تێنەپەڕییوەو نەبۆتە بەشێك لەزاکیرەی کوردی. ئەم رووداوە گەرچی لەمێژوودا روویداوە، بەڵام تاهەنووکەش لەهوشیاری مرۆڤی ئێمەدا بەتەواوی روونەداوە. هەموو ئەمانە وایکردووە ئەنفال پتر لەهوشیاری نوخبەیەکی سیاسیی و رۆشنبیریدا ئامادەی هەبێت و نەبووبێتە بەشێك لەخەیاڵ و هوشیاری مرۆڤی ئێمە.



**پرسیار:** ئەو پێشنیازە تایبەتیانەی ئێوە چین، بۆ ئەوەی ئەنفال وەك کارەساتێکی سیاسیی مێژوویی لەیادوەری ئینسانی کوردا بەچەشنێك بمێنێتەوە کە هەمیشە جێی ئاوڕدانەوەو قسەکردنبێت لەسەری لەلایەن ئەو نەوانەی کە لەدوارۆژی کۆمەڵگەی ئێمەدان؟

**رێبین هەردی:** گرنگترین شت ئەوەیە جارێ هەموو ئەم شتانە لەبیربکەین. کردنی ئەنفال بەبەشێك لەیادەوری پێویستی بەسیاسەتێکی جیاواز لەو سیاسەتی راگەیاندنە هەیە کە هێزە سیاسییەکانی کوردستان پەیڕەویدەکەن. کێشەکە پەیوەندی بەیادکردنەوەی ساڵانەو ئاهەنگی پرسەو نمایشی دیکۆمێنتەکانی کارەساتەکەوە نییە وەك راگەیاندنی رەسمیی تێیگەیشتووە. دواشت پێویستمان پێبێت ئەو رۆحی پرسەیەیە کە لەساڵیادی ئەنفالدا راگەیاندنی فەرمیی داگیردەکات. بەڵکو کارێکی ستراتیژیترو زیندوترمان پێویستە تا ئەو رۆحی هاودەردییە زیندووبکەینەوە کە رابردوو بەئێستاو داهاتووەوە گرێدەدات.

ئەو دۆخە سیاسییە پڕکارەساتەی کوردستان لەناوەڕاستی سەدەی رابردووەوە لەناویدا دەژی، تەنها کارەساتی سیاسیی نەبوون و تێپەڕیبن، بەڵکو ئەو هەورازو نشێوانە کاریگەری سایکۆلۆجی جیاوازی بەجێهێشتووە کە بۆتە هۆی وێرانبوونی ژیانی رۆحی مرۆڤی ئێمە. کۆمەڵگایەك ژیانی بەردەوام پڕ بووە لەچیرۆکی جەنگ و خیانەت و ناپاکی و کوشتنی بەکۆمەڵ، ئەستەمە بتوانێت بەبێ کۆمەڵێك کێشەی سایکۆلۆجی لەم ئەزموونە تاڵە بێتەدەرێ. لەهەمووی ترسناکتر لەدەستدانی توانای

هاودەردییە. کاتێك مرۆڤەکان خۆیان هەست بەمەترسی لەسەر ژیان و داهاتووی خۆیان بکەن، ئەستەمە بتوانن هەست بەهاودەردیی لەگەڵ کەسانی دیدا بکەن.

ئەمە جگە لەوەی ئەم مێژووە سیاسییە پڕبوو لەناکۆکی ناوخۆیی کە چەندانجار هێزە سیاسییە جیاوازەکانی بەرەو شەڕی ناوخۆ بەهەموو پێشهاتە کارەساتئامێزەکانییەوە راکێشا. کە شەڕی ناوخۆش هات هێزەکان بۆ دژایەتی یەك هەموو سنورەکان رێگەپێدراو و چاوەڕوانکراویان تێپەڕاندو گەیشتنە ئاستێك لەدژایەتی کە هیچ بەهایەکی نەتەوەیی و نیشتیمانی تیا رەچاو نەکرا. ئەم دژایەتییە لەئاستی سیاسییەو دابەزیە ناو خانە کۆمەڵایەتییەکان و خەڵکی کوردستانی بەجۆرێکی کوشەندە لەناوەوە پارچە چارچە کرد. هەستی ئینتیما بۆ نەتەوە لەبەردەم هەستی ئینتیما بۆ حزبە سیاسییەکاندا پاشەکشێی کردو هەموو ئەمانەش یەکپارچەیی کۆمەڵگای ئێمەی خستۆتە مەترسییەکی راستەقینەوە. ئەزموونی شەڕی ناوخۆ راستییەکی تاڵی بۆ سەلماندین: کۆمەڵگای ئێمە زۆر دڵڕەقترە لەڕووبەڕووبوونەوەی نەیاری ناوخۆدا پتر لەڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ دوژمندا.

هەموو ئەم هەلومەرجە کۆمەڵگایەکی ناتەباو نارێك و دوور لەیەکی دروستکردووە کە لایەنیکەمی پەیوەندی لەنێوانیدا نییە. کۆمەڵگایەکیش هەنووکەی پڕ بێت لەم هەموو دابڕان و رق و دوورییە، ئەستەمە توانای هەستکردن بەکارەساتێکی رابردوو کۆی بکاتەوە. کەوابوو بەر لەهەر شتێك پێویستمان بەبنیاتنانەوەی ئەم مرۆڤە هەیە. پێویستمان



بەکۆتاپهێنان بەم دابەشبوون و دژایەتی و پارچە پارچە بوونە هەیە کە لایەنیکەمی هاودەردی لەنێوان بەشەکانیدا نییە. کارێك کە دەبێت بیکەین پەیوەندی بەبنیاتنانی ئێستاوە هەیە لەسەر نەخشەیەکی تەواو جیاواز لەو نەخشەیەی ململانێی سیاسیی و جەنگ و کوشتار دروستیکردووە. پێویستمان بەگێڕانەوەی متمانەی مرۆڤی ئێمە هەیە بۆ ژیان و داهاتوو.. پێویستمان بەدروستکردنی ژیانێکی ئارام و هێمن و تەبایە کە کەس تیاییدا ئارەزووی مردنی ئەویدی نەکات کە لەوناچێت یان هەڵبژاردنێکی دی هەیە. هیچ یەك لەم شتانەش روونادەن گەر کۆتایی بەم سیستەمە حیزبۆکراتییە نەیەت کە کۆمەڵگای ئێمەی وەك کۆمەڵێك دوژمنی سیاسیی لەبەرامبەر یەکدا داناوە.

گەر دەمانەوێت ئەنفال بەشێك بێت لەخەیاڵی مرۆڤی ئێمە پێویستە هەلومەرجێکی سیاسیی و کۆمەڵایەتی بخوڵقێنرێت کە لایەنیکەمی خوشنوودی و بەختەوەریی و دادپەروەری بەمرۆڤەکانی ببەخشێت. تا ژیانی رۆحی ئەم کۆمەڵگایە کە جەنگ و کشوتارو ناپاکیی وێرانیکردووە، رێك نەکەینەوە، ئەستەمە بتوانین داوای لێبکەین ئەنفال بەشێك لەزاکیرەی پێکبهێنێت. هەرچی جوانکردنی ئێستاو بەنرخکردنی ژیان و سەروەری بەختەوەری، نەك پرسەی ساڵانەو یادی سیاسییانە، ئەو ستراتیژەیە کە دەبێت پەیڕەوبکرێت تاکو ئومێدمان بەڕۆژێك بێت کەبەڕاستی ئەنفال ئەم کۆمەڵگایە لەناوەوە دەجوڵێنێت.

**پرسیار:** ئایا ئەدەبی کوردی بەتەعریفە جیاوازەکانی ئێوەوە بۆ ئەدەب چەند بەرپرسیارە لەبەردەم بیرنەکردنەوە لەئەنفال؟

**رێبین هەردی:** کاتێك ئەنفال نەبوویێتە بەشێك لەیادەوری مرۆڤی ئێمە، چۆن دەتوانێت ببێت بەبەشێك لەئەدەب. ئەدەبی ئێمە هەرگیز لەکێشەو گرفتە ئاڵۆزەکانی کۆمەڵگای ئێمەوە دوور نەبووەو پەیوەندییەکی تەنگاوتەنگی بەو هەلومەرجە سیاسیی و کۆمەڵایەتییەوە هەبووە کە لەناویدا ژیاوە. سەردەمێك ئەدەب چەکی بەرگری خەڵکی کورد بوو لەزمان و شوناسی خۆی لەلایەك و سەکۆی هاندانی گیانی بەرگری بوو لەبەردەم دوژمناندا لەلایەکی دیەوە. لەدوای راپەڕینیشەوە کە وا چاوەڕواندەکرا ئەنفال بەشێکی گرنگ لەخەیاڵی هونەری ئەدەبی کوردی پێکبهێنێت و ئاوڕی لێبداتەوە، نووسەرانی ئێمە رووبەڕووی ململانێیەکی حیزبیی توند بوونەوە کە بەشەڕی ناوخۆ گەیشت. گەر بگەڕێیتەوە بۆ ئەوکاتە دەبینیت زووربەی کارە ئەدەبییەکانی ئەو ماوەیە بەشێوەیەك لەشێوەکان پەیوەندی بەشەڕی ناوخۆوە هەبووە. شێرکۆ بێکەس کە بەر لەڕاپەڕین دەربەندی پەپوولەی وەك پانۆرامای یەکگرتووی ئازارەکانی کورد نوسیبوو، لەدوای راپەڕین "خاچ و مارو رۆژژمێری شاعیرێکی نووسی" کە سەر لەبەری دادگایکردنی ئەو دژایەتی و کەرتبوونە ناوەکییە بوو کە کوردستانی خستبووە بەر گەورەترین مەترسی. تەنانەت ئەدەبی شێرزاد حەسەن کە تا بەر لەڕاپەڕین لەسەر تاکەکەس و حەزو ئارەزووەکانی کاریدەکردو بەمەش دەنگێکی تایبەتی



بۆ خۆی دروستکردبوو، لەدوای راپەڕینەوە زۆرینەی چیرۆکەکانی بەشێوەیەك لەشێوەکان پەیوەندییان بەم ناکۆکی و دژایەتیانەوە هەبوو..حەسارو سەگەکانی باوکم، کەڵەکێوی و ئاسکە کچان بەشێوەیەك لەشێوەکان چیرۆکی ناتەبایی و نایەکانگیریی کۆمەڵگای کوردیان لەدوای راپەڕینەوە دەگێڕایەوە. بەختیار عەلی لەهەردوو رۆمانی ئێوارەی پەروانەو دواهەمین هەناری دنیا–دا ئەم ناکۆکیەی کردبووە شانۆی هەردوو رۆمانەکەی کە پاڵەوانەکانی دۆخێکی تراژیدی دەژیان و بەکارەساتیش کۆتاییان پێدەهات.

رەنگە هەنوکەو ئێستا کە دادگای سەدام حسێن و دارو دەستەکەی لەسەر رووداوەکانی ئەنفال تەواو بووە، ئێمە بۆ یەکەمجارە بتوانین گوێبیستی ئەو چیرۆك و بەسەرهاتانە بین کە بەشداربووانی کارەساتەکە دەیگێڕنەوە. ئێستا خەریکە بەڕاستی گوێمان لەبەسەرهاتەکانی ئەنفال دەبێت و لەهەقیقەتی کارەساتەکە تێدەگەین. پڕ ئاشکرایە لەدۆخێکدا کە هێشتا ئەنفالەکان خۆیان نەکەوتوونەتە قسەو هەموو بەسەرهاتەکانی خۆیان نەگێڕاوەتەوە، ناتوانین قسە لەکارەساتەکە خۆی بکەین، چ بگات بەوەی قسە لەکاردانەوەی لەسەر ئەدەب. بۆ ئەوەی ئەم راستییەش ببینین هەرئەوەندە بەسە بڵێین رووداوەکە لەسەر رۆژژمێری مێژووی دەگەڕێتەوە بۆ کۆتایی هەشتاکان، بەڵام دەرکەوتنی راستەقینەی لەئەدەبدا دەگەڕێتەوە بۆ 2004 و 2006 بەتایبەتی هەر دوو بەرهەمی گۆڕستانی چراکانی شێرکۆ بێکەس و شاری مۆسیقارە سپییەکانی بەختیار عەلی–دا. واتە پاش پتر لە15 ساڵ لەڕوودانی

کارەساتەکە. بەدیاریکراویش دوای کۆتایهاتنی شەڕی ناوخۆو کەوتنی ڕژێمی بەعس. ئەمە ئەو ڕاستییە دەسەلمێنێت کە پێشتر نووسیم: کۆمەڵگایەك بۆ ئەوەی بتوانێت لەسەر کارەساتێکی ڕابردووی خۆی قسە بکات، دەبێت لایەنیکەم دۆخێك بژی کە خۆی دووربێت لەڕووداوی گەورەو ترسناکەوە. ڕاستت بوێت ئەدەب تاکە ڕزگارکەری ڕاستەقینەی مرۆڤە لەبێپەروایی و بێهودەیی. ئەدەبە وامانلێدەکات مرۆڤانەترو قوڵتر لەژیان و کارەساتەکانی بگەین. ئێستا دەبێت بۆ وەڵامەکانی سەرەوەم ئەم خاڵە زیاد بکەم، ئەنفال هەرگیز ناتوانێت ببێت بەبەشێك لەزاکیرەو خەیاڵی ئێمە گەر نەبێتە ئەدەب. کاریگەری شاری مۆسیقارە سپییەکان و گۆڕستانی چراکان دەیانجار لەکاریگەری ئەو دۆکیۆمێنت وساڵیادانەی پرسە گرنگترە کە بۆ ئەنفال ساز دەکرێت. کارەساتەکان بۆئەوەی کاریگەری لەسەر هوشیاری مرۆڤ بەجێبێڵن پێویستیان بەئەدەب دەیانجار زیاتر لەزانستی مێژوو هەیە، چونکە مێژوو دەتوانێت تەنها ساڵی تاوانەکەو ڕووبەرەکەی و هۆکانی و دەرئەنجامە سیاسییەکانی بڵێت، بەڵام تەنها ئەوە ئەدەبە ئەم ڕاستیە مێژوویيانە دەکاتە خوێن و ئێسقان و لەتراژیدیای پاڵەوانەکانیدا پیشانیدەدات. مێژوو بێڕۆحە گەر ئەدەب بەرگی مرۆڤی ڕاستەقینەی لەبەرنەکات و بەڕووداو و بەسەرهاتە جۆراوجۆرو وردەکارییەکانی ژیاندا نەیبات. ئەمەش خۆی جیاوزای گێڕانەوەی مێژوو و ئەدەبە. لەکاتێکدا مێژوو سەردێڕە گەورەو دیارەکانی بۆ گرنگە، ئەدەب وردەکارییەکان و نمایشکردنەوەی ڕووداوەکەی لەپێچ و پەناکانی ژیاندا بۆ گرنگە. هیچ کارەساتێك ناتوانێت ببێتە کارەساتێك کە



بەشێکی گرنگ لەخەیاڵ و هەستیاریی مرۆڤەکان پێکدەهێنێت، گەر نەبێتە ئەدەب و هونەر.

بەڵام هەرگیز ئەدەب ناتوانێت بەشێك نەبێت لەژیان و بەشێوەیەك لەشێوەکان کاری تێنەکات. نووسەران ناتوانن هەمیشە ئاوڕ لەدواوە بدەنەوە گەر ئێستایان پڕ بێت لەسەدان ناشرینی و ناپاکی و نادادپەرەریی. ئەدەبی ئێمە گەر کەم قسەی لەئەنفال کردووە، لەبەرئەوەیە سەرقاڵی ئەو میحنەتانەیە کە نەوەکانی ئەنفال لەهەنووکەدا تیای دەژین. کەوابوو بۆ ئەدەبیش هەمان ئەو قسەیە ڕاستە کە پێشتر لەبارەی هۆکاری فەرامۆشکردنی ئەنفالەوە گوتمان.

پرسیار: ئایا ئاستی ئەو ترسە شاراوەیەی لای ئینسانی کورد هەیە بەرامبەر کوردبوونی خۆی، ترسێکە خاوەنی هێزیکی ڕۆشنبیری وایە کە بتوانێت لەبری تۆڵە خۆی بکات بەهێزێك کە هەڵگری لێبووردن بێت. ئایا ئەم هێزە چەند دەسەڵاتی کوردیی لێی بەرپرسیارەو چەندیش کۆمەڵگەی کوردی و ڕۆشنبیرەکانی بەرپرسیارن لەپیشاندانی؟

وەڵام: بیرۆکەی تولە لای هیچ مرۆڤێك پاشەکشێ ناکات، گەر کۆمەڵێك دەزگا نەبن کە وای لێبکەن پێویستی بەبیرۆکەی تولە نەبێت. بیرۆکەی تولە نائومێدبوون یان نەبوونی ئەو دەزگایانەیە کە دەتوانن لایەنیکەمی ڕێکخستن و دادپەروەری بسەپێنن. ناتوانین بەئامۆژگاری و بیرۆکەی پەروەردە پاشەکشێ بەلۆژیکی تولە بکەین. ناتوانین ستەملێکراوێك بەئامۆژگاری و بانگهێشتکردنی بۆ لێبوردن ڕابکێشین، لەکاتێکدا ستەمکار بەئازادانە دەژی و هیچ پرسیارێکی لێناکرێت. کێشەکە پەیوەندی بەکاری

ڕۆشنبیری و کەمتەرخەمی ڕۆشنبیرانەوە نییە، بەڵکو پەیوەندی بەنەبوونی ئەو دەزگا ڕەسمیانەوە هەیە کە ئەرکی جێبەجێکردنی دادپەروەرییان لەسەر شانە. مرۆڤ ناتوانێت بەگیانێکی مەسیحیانە واز لەمافەکانی بێنێت و بڵێت من دەتوانم لەتاوانبارەکەم ببورم. بیرۆکەی لێبووردن تەنها لەکاتی بەهێزیدا مانای هەیە. مرۆڤێکی بێهێزو بێدەسەڵات ناتوانێت ببورێت و ئەوی مافەکەی خواردووە بەئازادانە بژی. گەر دەزگاگەلێکیش نەبن بتوانن ئەم مافەی بۆ وەربگرن، ناتوانێت واز لەبیرۆکەی تولّە بێنێت. کەوابوو زاڵبوونی بیرۆکەی تولّە پەیوەندییەکی تەنگاو تەنگی بەنائومێدبوون و بڕوانەبوون بەو دەزگایانەوە هەیە کە بڕیارە جێگەی وەرگرتنەوەی ماف بن. تا بێهێزیی و بێدەسەڵاتی خەڵکی ئێمە بەردەوام بێت و دەزگاگەلێکی ڕەسمیش نەبن بەڕاستی جێگەی وەرگرتنەوەی ماف بن، بیرۆکەی تولّە بەشێوەی جیاواز بەردەوام دەبێت. هەستکردن بەبێهێزیی و بێدەسەڵاتی خەڵکی ئێمەش، هێزە سیاسییەکان بەرلەهەر کەسێکی دی لێی بەرپرسیارن. خەڵکی ئێمە هەرگیز هەست بەبوونی خۆی لەهیچ شتێکدا ناکات. ئەو لەبەردەم ماشێنی حیزبدا هەمیشە خۆی بەلاواز بینیووەو هەرگیز هەستینەکردووە، دەنگ و ڕای ئەو لەوڵاتدا گرنگ و جێی بایەخە. وڵات بەدەست لێپرسراوانێکەوەیە کە لەژیانی ئەوەوە ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر دووردەکەونەوەو هەستناکەن چیدی بەشێکن لێیان. نەچوونی خەڵکی بۆ سندوقەکانی دەنگدان بەئاشکرا ئەم هەستی لاوازیی و بێدەسەڵاتییە دەردەخات. خەڵك ناچێت بۆ دەنگدان، چونکە بڕوای وایە دەنگی ئەو هیچ نییەو حسابی بۆ ناکرێت. شتەکان



لەنێوان بەرپرسیاراندا بەشکراون و ئەم هیچی لەسەر نییە جگە لەڕازیبوون. کە هەست بەلاوازیی و بێدەسەڵاتیش گەورەبوو، هەمیشە بیرۆکەی تولّە ئامادە دەبێت.

بێدەسەڵات و لاواز کە لێبورد لەڕاستیدا نەبوراوە، بەڵکو ترساوە، کە دەسەڵاتدارو بەهێزیش نەبورا، واتە شتێکی ئەخلاقی لەدەستداوە. خەڵکی ئێمە بۆ ئەوەی توانای لێبووردنی هەبێت، دەبێت هەست بەبەهێزیی و دەسەڵاتداریێتی بکات و خۆی بەخاوەنی خۆی بزانێت. ئەوسا دەتوانێت ڕۆحی مرۆڤانە لەخۆیدا زیندوو بکاتەوەو بەئاسودەییەوە لەزەتی لێبووردن تاقیبکاتەوە.

**پرسیار:** بۆ دەبێت هەمیشە چاوەڕوانییەکی گەورە لەئەدەب بکرێت بۆ گێڕانەوەی کارەساتە گەورەکانی مرۆڤایەتی؟ ئەم هۆی چاوەڕوانییە لەکوێوە هاتووەو چۆن لای مرۆڤ دروستبووە؟

ئەی گەر وایە بۆ ئێمە لەئەدەبی کوردیدا بەرهەمی داهێنەرانە هەر زۆر کەمدەبینین لەبەردەم کارەساتێکی گەورەی وەك ئەنفالدا؟

**ڕێبین هەردی:** پرسیارەکە پێچەوانە بکەینەوە. ئایا جگە لەئەدەب و هونەر هیچ شتێکی دی دەتوانێت گوزارشت لەئەنفال بکات؟ زۆرینەی کارەساتەکانی دنیا بەپلەی یەکەم لەڕێگەی ئەدەبەوە گوزارشتیان لێدەکرێت، نەك لەڕێگەی هیچ شتێکی دیەوە. دەشێت زانستی مێژوو زانینی وردمان لەسەر ڕووداوەکەو کاتی ڕوودانی و بکەرەکانی و

جوگرافیای كارەساتەكەی تیا روودا، پێشكەش بكات، بەڵام مومكین نییە ئەو ئازارو ئەشكەنجە فەردی و تایبەتیانە وێنا بكات كە كەسە تایبەتەكان لەناویدا ژیان. مومكین نییە ئەو رۆحە پڕ ئازارو ئەو گریان و هاوارو ئەشكەنجانە دەربخات كە بەشداربووانی كارەساتەكە هەستیان پێكرد. زانستی مێژوو پێماندەڵێت كیمیایی چۆن و لەكوێ و لەلایەن كێوە بەكارهێنراو چ كەسانێكی بەركەوت، بەڵام تەنها ئەدەبە دەتوانێت، بۆ نموونە لەكەسایەتییەكی منداڵی وەك سەریاسی سێهەمداو هەموو دانیشتووانی خەستەخانەكەی ناو دواهەمین هەناری دونیادا، وێنای ئەو كارەساتە رۆحیە بكات كە بریندارانی كیمیایی تووشی دەبن. مێژووی پێماندەڵێت ئەنفال كەی و لەرێگەی چ لەشكرێكەوە دەستپێكردو چەند دێ و گوندو ناوچەی وێرانكرد، بەڵام تەنها ئەوە ئەدەبە لەرێگەی بۆ نموونە كەسایەتییەكی وەك جەلادەتی كۆترو دالیا سەراجەدینەوە، دەتوانن ئەو دۆخە كارەساتاوییە مەعنەوییەمان پیشانبدات كە مرۆڤەكان بەسەریاندا دێت. دەشێت مێژوو ژمارەی كوژراوەكانمان پێبلێت، بەڵام تەنها ئەوە لەگۆڕستانی چراكاندایە ئەو ژمارەیە لەژمارەیەكی حسابی رووتەوە، دەبێت بەژمارەیەك رۆح و گیانمان دەهەژێنێت. بەمانایەكی دی مێژوو رووداوەكانمان لەدەفتەرو ئەرشیفێكدا بۆ تۆماردەكات، بەڵام تەنیا ئەوە ئەدەبە ئەو رووداوە لەرۆحماندا، نەك لەناو پەرەو ئەرشیفدا، بۆ تۆماردەكات. واتە ئەوە ئەدەبە مێژوو لەپێدراوێكی بابەتییەوە دەكات بەپێدراوێكی رۆحی كە كار لەسەر پێكهاتنی ئاسۆی هوشیاریمان دەكات. ئەوە ئەدەبە رێگە نادات مێژوو ببێت بەمێژوویەك بۆخۆی و دەیكات



بەمێژوویەك بۆ ئێمەو رۆحی ئێمە. بێ ئەدەب و هونەر مێژوو پێدراوێكی بێگیان و رۆحە كە وەك وانەی قوتابخانە دەشێت لەبەری بكەین، بەڵام بێئەوەی ببێت بەبەشێك لەهوشیاریی و پێكهاتن و كامڵبوونی رۆحی ئێمە. مێژوو بۆئەوەی ببێت بەبەشێك لەپێكهێنەری هوشیاری مرۆڤ، هەمیشە پێویستی بەئەدەبە، بۆئەوەی بتوانێت لەرۆژژمێرە بابەتییەكانی خۆیەوە، ببێت بەرۆژژمێرێك لەناو گیان و هوشیاریی مرۆڤدا. ئایا ئێستا دەتوانین بڵێین كزیی زاكیرەی مێژووی كورد، بەشێكی دەگەڕێتەوە بۆئەوەی ئەم مێژووە بەهەموو رووداوە ناخۆشەكانییەوە هاودەمی ئەدەب و هونەرێك نەبووە كە خەیاڵ و ئاسۆی هوشیاریمان پێكبهێنێت؟ نازانم! بەڵام دەزانم هیچ كارەسات و رووداوێكی مێژوویی بەبێ ئەدەب و هونەر ناتوانێت رۆح و عەقڵیەتی ئەو مرۆڤانە بگۆڕێت كە ئەو مێژووە ژیان یان دەژین.

# نەزەند بەگیخانی



**تا کورد خۆی ساخ نەکاتەوەو سەنگەری خۆی دیاری نەکات لەو هاوکێشەیەی نێوان زاڵ و ژێردەستە، ئەوە ناتوانێت ببێتە داکۆکیکاری ئەنفال و ئەنفال بەرزبکاتەوە بۆ ئاستیوتارێکی جیهانیی بۆ ماف و ئازادیی کوردو هەموو ئەوانەی بەرەورووی جینۆساید دەبنەوە.**

**دەبێت ئەنفال ببێتە بنچینەیەکی مۆرالی-یاسایی بۆ داواکاریی کورد بۆ قەرەبووکردنەوەو دابنیکردنی مافی قوربانییەکان، نەك تەنها بۆ پارە بەخشینەوەو زیادکردنی حەزی خەرجکردن و ئارەزووی بێسنوری بەفیرۆدان و دروستکردنی دیاردەی مشەخۆری کە خەریکە لەکوردستان پەرەدەسێنێت، بەڵکو بۆ شەرعیەتدان بەمافی کورد لەئازادیی و سەربەخۆیی و دروستکردنی دەوڵەت.**

نەزەند بەگیخانی



**پرسیار:** ئەگەر بهاتایە ئەنفال لەوڵاتێکی ئیسلامیدا روویندایەو هەروەها مانایەکی ئیسلامیشی پێنەدرایە، پێتانوابوو ئەنفال بتوانرایە نوقمی بێدەنگییەکی وابکرێت هەم لەلایان وڵاتانی دراوسێوە تا دەگاتە هەموو وڵاتە ئیسلامییەکانی دنیا، ئەوسا وڵاتانی ئەوروپاش.

**نەزەند بەگیخانی:** ئەم مەسەلەیە بەقەد ئەوەی پەیوەندی بەئیسلامەوە هەیە، پەیوەستیشە بەعەقڵیەتی عەرەب و دەسەڵاتی وڵاتانی عەرەبیەوە. نەبوونی گوتارێکی هاوسۆزی عەرەبی بۆ کێشەی کوردو جینۆسایدی ئەنفال مانای نەبوونی عەقلی ئازادیی عەرەبی و ئیسلامی دەگەیەنێت، شکستی ئازادیی تاکی عەرەب و موسڵمان رادەگەیەنێت کە سیاسەتی بێدەنگیی پیادە دەکات. بۆئەوەی کارەساتێکی وەکو ئەنفال بناسرێت و مەوداکانی بەجیهان بناسێنرێن، دەبێت لەبازنەی بێدەنگی بێتەدەرەوەو بخرێتە ناو گوتاری سیاسی و گوتاری تایبەت بەجینۆسایدو مافی مرۆڤ، واتە بەجیهاندا بڵاوبکرێتەوە. ئەمەش کەسانی بەئاگاو رۆشنبیر دەبێت پێی هەڵبستن. زۆر کەم لەرۆشنبیرانی عەرەب گەیشتونەتە ئەو ئاستەی کە بتوانن گوتارێکی سەربەخۆو عەقڵانی دابرێژن لەدەرەوەی گوتاری رەسمیی عەرەبی و پەنماو بەهەستی ئایینی و نەتەوەیی. نەبوونی پاشخانێکی ئێپیستۆمۆلۆژیی لەدەرەوەی ئایین و وابەستەبوون بەناسیۆنالیزمی عەرەبیەوە رێگایان نەداوە بەرۆشنبیری عەرەب گوتارێکی پابەند

بەڕاستی و ماف و ئازادیی خۆیی و کەسانی چەوساوەو مافخوراو دابڕێژێت و سیاسەتی بێدەنگی بشکێنێت. ئەو وابەستەیە بەدەسەڵات و ناسیۆنالیزمی عەرەبیەوەو ماف و ئازادیی لەڕوانگەی مەسەلەی فەلەستینەوە دەبینێت. هەر دەسەڵات و ئایدیۆلۆژیەك پشتگیری لەمەسەلەی فەلەستین بکات، ئەگەر فاشی و دیکتاتۆریش بێت، بۆ رۆشنبری عەرەب دەبێتە شوێنی ئیلهام و هیواو بەرەوڕووبوونەوەی دەسەڵاتی 'ئیمپریالی'.

لەم بارودۆخەدا ئایدیۆلۆگە ناسیۆنالیستە عەرەبەکان چەشنی دەسەڵاتداران مێژوویەك دەنووسنەوە، گوتارێك دادەڕێژن کە بێلایەن نییە، رووداوەکان لەگۆشەنیگای سیاسیی و خۆیانەوە دەخوێننەوەو تۆماردەکەن بۆ شەرعیەتدان بەخۆیان و بەبەردەوامیی خۆیان و ئایدیۆلۆژیاکەیان، بەناسیۆنالیزمی عەرەبی 'خاوەن پەیامێکی نەمر– ذات رسالة خالدة'. تۆمارکردنی ئەنفال کە دەربڕی فیکری تۆتالیتاری بەعس و ئایدیۆلۆژیای نەتەوەیی عەرەبییە لەبەرژەوەندی دەسەڵات و ناسیۆنالیستە عەرەبەکان و ریسالە نەمرەکەیاندا نییە. بۆیە لەگوتاری رۆشنبیرانی عەرەب و گوتاری رەسمی دەسەڵاتدارانی عەرەب بێدەنگی لێدەکرێت. تا رۆشنبیری عەرەب تەجاوزی ئەو دەسەڵاتەو ئایدیۆلۆژیای ناسیۆنالیزمی عەرەبی نەکات و سیاسەتی بێدەنگی نەشکێنێت، ئەوە ناتوانێت لەسەنگەری دەرەوەی ئایدیۆلۆژیاو دەسەڵات خۆی بەرجەستە بکات و بەرگری لەخەبات و مێژووی ژێردەستەو مافخوراوان بکات و



راستییەکان و رووداوەکان لەگۆشەنیگایەکی دیکەوە تۆمار بکات بەجۆرێك کە ببێتە بەرگری لەماف و ئازادیی مرۆڤ. رۆشنبیری عەرەب، هەروەکو کەنعان مەکییە دەڵێت: دوو هەڵوێستی هەیە: یان بێدەنگ دەبێت یان کە دێتە گۆ بەبیانووی ئایدیۆلۆژیەوە حاشا لەکارەساتەکە دەکات.

ئەنفال لەلایەن دەسەڵاتدارێکی عەرەبییەوە پلانی بۆ دانراوەو جێبەجێکراوە کە لەخەیاڵی گشتیی عەرەبی وەکو پاڵەوانێك لەقەڵەمدەدرێت کە گوایە توانیویەتی بەرەوڕووی رۆژئاوا بێتەوە، لەم روانگەیەوە ئەگەر دەسەڵات و رۆشنبیری عەرەب دان بەئەنفال دابنێن ئەوە خۆیان بەو شێوەیەی کە هەن دەسڕنەوە. لەناو عەرەب کەسانی وەکو کەنعان مەکییە پێویستن کە وەکو رۆشنبیرێکی جەسوری عەرەب توانیویەتی تەجاوزی عەقڵیەتی زاڵی عەرەبی و ئیسلامی بکات و لەکاتی خۆیدا هاتە گۆو حەقیقەتی رژێمی بەعسی لە چەند گوتارێکی بێلایەن خستەڕوو. بەڵام چەند کەنعان مەکییە لەناو عەرەبدا هەیە؟ تەنانەت رۆشنبیرێکی گەورەی وەکو ئێدوارد سەعیدیش کە زۆر نووسەری کورد دەیپەرستن ئامادە نەبوو رژێمی بەعس تاوانبار بکات و رەخنەی لەنووسینەکانی مەکیە دەگرت و تاوانباری دەکرد بەوەی کە 'بەکرێگیراو' بێت. رۆشنبیری عەرەب بۆ کورد نایەنە گۆ، چونکە ئایدیۆلۆژیای ئەوان سەرەڕای نەتەوەپەرستی، بۆ هەڵسەنگاندنی مرۆڤ و نەتەوەکان بنچینەیەکی هایرارکی هەیە. لەناو خەیاڵی گشتیی عەرەبی، هەروەها هی تورك و فارسیش، کورد پایەو پلەیەکی نزمی هەیەو ئەو خۆی بۆ تەرخان

ناكات و داكۆكی لێناكات. دامودەزگاكانی راگەیاندن و پەروەردەو كولتوری ولاّتانی عەرەبیش ئەو ئایدایۆلۆژیایە پیادە دەكەن. ئەنفال لەدەرەوەی مێژووی رەسمی عەرەبیدا ماوەتەوەو هەرواش دەمێنێتەوە، چونكە ئەو دەسەلاّتە سەر بەسیستمێكی دیموكراسی و مافپەروەر نییەو هەروەها لەبەرئەوەی لەجەمسەرەكەی دیكەی دەسەلاّت كەسانی ئازادو داكۆكیكار لەمافی مرۆڤ و راستیی رووداوەكان كەمن تا بتوانن ئەو مێژووە رەسمییە زاڵە هەڵبوەشێننەوەو ناسیۆنالیزمی عەرەبی بخەنە ژێر پرسیارەوەو شەرعیەت بدەن بەماف. كوردیش ئەگەر ئیمڕۆ تەنها لەڕوانگەی دەسەلاّتەوە بڕوانێتە ئەنفال ئەوە ناتوانێت گوزارەیەكی راستەقینە، بەو شێوەیەی كە روویداوەو كورد تێیدا ژیاوە، لەو كارەساتە بكات.

دەربارەی بێدەنگیی رۆژئاوا، راستە رۆژئاوا لەكاتی ئەنفال و ژەهراویكردنی كورد بێدەنگیی پیادە كردووەو رووداوەكان لەمیدیا وەكو پێویست قسەیان لەسەر نەكراوە، ئەمەش پەیوەندی هەیە بەهەڵوێستی سیاسیی رۆژئاوا بەرامبەر بەسەدام حوسێن لەسالاّنی هەشتادا (پێویستە بزانین كە میدیا لەهیچ شوێنێك لەسەدا سەد سەربەخۆ نییەو پابەندە بەسیاسەتەوە). ئەگەر قسەشی لەسەر كرابێت لەهەشتاكان ئەوە وەكو مەسەلەیەكی مرۆڤایەتی بووە نەك سیاسیی. هەروەكو بینیمان دوای داگیركردنی كوێت لەلایەن سەدام حوسێنەوە، هەڵوێستی سیاسیی رۆژئاوا



گۆڕاو ئەنفال خرایە ناو رۆژەڤی دەزگاكانی میدیاو رێكخراوەكانی مافی مرۆڤ و بووە مەوزوعی لێكۆڵینەوەو ریپۆرتاژی میدیای نووسراو و بیستراو.

**پرسیار:** ئەو هۆكارانە چین كە ئەنفال لەهۆشیارییەكی سیاسیی سادەوە كە تەنها لەیادكردنەوەی سەرپێیانەی سالاّنەدا قەتیسبووە دەگوازێتەوە بۆهۆشیارییەكی كەلتوری، لەو بێدەنگییەی كە خاوەنی قسەنییە دەگوازێتەوە بۆ بیركردنەوەیەك بەدەنگی بەرز. هەروەها ئەم بێدەنگییە چەند پەیوەندی بەكورد خۆیەوە هەیە، هەم لەئاستی بەرپرسیارییەتی كۆمەڵگای كوردی بۆ ئەنفال و هەم لەئاستی دەسەلاّتی كوردیی خۆیدا؟

**نەزەند بەگیخانی:** دەسەلاّتی كوردیی لەنێوان دەسەلاتی زاڵی عەرەبی– ئیسلامی و پۆزیسیۆنی خۆی وەكو بەشێك لەزاڵبوو–ژێردەستە لەحاڵەتێكی ئاڵۆزدایە بۆ گوزارەكردن و شەرعیەتدان بەخۆی لەلایەك و بەكارەساتێكی وەكو ئەنفالیش لەلایەكی دیكەوە. مەبەستم ئەوەیە: دەسەلاّتی كوردی دەبێت لەچ سەنگەرێكەوە بڕوانێتە ئەنفال؟ سەنگەری دەسەلاّتدارو حزبی كە رووداوەكان بەپێی بەرژەوەندی تایبەتی خۆی و بۆ شەرعیەتدان بەمانەوەی خۆی تۆمار بكات و تاوتوێیان لەگەڵدا بكات؟ یان سەنگەری زوڵملێكراو و مافخوراوەكان، سەنگەری خەڵك؟ گومانی تێدانییە كە گوزارەكردن لەئەنفال و تاوتوێی سیاسیی لەگەڵیدا دەبێت لەسەنگەری

میللەتەوە بێت و دەسەڵاتیش مێژووی خەڵك و راستییەکان لەمەڕ ئەنفال وەکو روویانداوە تۆمار بکات و بەجیهانی بناسێنێت. تەنها لەم رێگایەوە دەسەڵاتی کوردیی بواری بۆ دەڕەخسێت هەم گوزارە لەماف و ئازادییەکانی خەڵك بکات و هەمیش شەرعیەت بدات بەداواکاریی خەڵکی کورد بۆ بەدەستهێنانی ماف و ئازادیی. بەڵام ئیمڕۆ دەسەڵاتی کورد لەبارێکی ئاساییدا نییەو زانین و تێگەییشتنی قووڵی پێویستە تا ئەنفال چەشنی هۆلۆکۆست لەگوتارێکدا جێگیر بکات کە ببێتە پرینسیپ بۆ داواکردنی ماف و ئازادیی نەك تەنها کورد، بەڵکو مرۆڤ لەسەر ئاستی جیهانی، هەروەکو چۆن ئیمڕۆ هۆلۆکۆست بۆتە بوارێك بۆ دەربڕین و بەرگریکردن لەپرینسیپەکانی مافی مرۆڤ و ئازادیی لەسەر ئاستی نێودەولەتی. پێویستە دەسەڵاتی کوردی خۆی ساخ بکاتەوەو هەڵوێستی هەبێت و کارەساتی ئەنفال وەکو روویداوە بگێڕێتەوەو بیهێنێتە ناو رۆژەڤی سیاسیی نەتەوەیی خۆیەوە، نەك وەکو پارتی یان یەکێیتی، بەڵکو وەکو دەسەڵاتێکی نەتەوەیی مۆدێرن و مەدەنی بێت راستییەکان لەسەر ئاستی ناوەوە و دەرەوە دەربڕێت، هەڵەکان دیاری بکات و دانیان پێدابنێت، رۆلی جاشەکان دیاری بکات و وەکو پێویست بیانداتە دادگا، دادگایەکی بێلایەن و سەربەخۆ لەدەرەوەی دەسەڵات و بەربەرەکانێی سیاسیی و حزبی. دەسەڵاتی عەرەبی–ئیسلامی و وڵاتانی رۆژئاواو زلهێز بخاتە ژێر پرسیارەوە، تا کورد خۆی ساخ نەکاتەوە و سەنگەری خۆی دیاری نەکات لەو هاوکێشەیەی نێوان زاڵ و ژێردەستە، ئەوا ناتوانێت ببێتە داکۆکیکاری ئەنفال و ئەنفال بەرز بکاتەوە بۆ ئاستی گوتارێکی



جیهانیی بۆ ماف و ئازادیی کوردو هەموو ئەوانەی بەرەوڕووی جینۆساید دەبنەوە.

راستییەکان دەربارەی ئەنفال لەسەر ئاستی ناوخۆ و دەرەوە بەتەواوی نەزانراون“ کێ گازی کیمیایی بەسەدام فرۆشت؟ بۆ جیهان بێدەنگ بوو لەو کاتانەی کورد وەکو مێش و مەگەز ژەهری پێدادەکرا؟ ئەو راستیانە کاتێك دەزانرێن کە دەسەڵاتێکی کوردیی مۆدێرن و خەمخۆریی گشتی بێت بەمتمانەو باوەڕەوە بێتەگۆ هەم بۆ دەربڕینی راستییەکان و هەم بۆ چەسپاندنی مافی کورد وەکو نەتەوە لایەنە پەیوەندیدارەکان بەبێ مساوەمە بخاتە ژێر پرسیارەوە. بەداخەوە ئیمڕۆ دەسەڵاتی کوردی لەو ئاستەدا نییە. دادگاکردنی سەرانی بەعس و بکەرەکانی ئەنفال کە دەبوایە ببێتە رووداوێکی گەورەو جیهانی بۆ ئاشکراکردن حەقیقەت و بۆ شەرعیەتدان بەداواکاری کورد لەئازادیی و سەربەخۆییبوون، هەروەکو بینیمان بچوککرایەوە بۆ ئاستێکی ئاسایی ناوخۆ و بێبایەخ لەپێناویی راگرتنی ئەوەی کە خۆیان پێیدەڵێن باڵانسی سیاسیی لەعێراق (باڵانسێك کە هەرگیز روونادات) و رازیکردنی ئەمریکا، هەروەها لەپێناوی مساوەمەی نێوان یەکێیتی و پارتی. هەروەکو بینیمان لەدادگاکانی ئەنفالدا مساوەمەی نێوان یەکێیتی و پارتی گرنگتر بوو لەهەڵوێستێکی سیاسی و ئەخلاقی کوردی و بەرپرس لەبەرامبەر کارەساتەکە. مساوەمە لەسەر ئەوەی دادوەرو پارێزەرو شایەدحاڵ پارتی بن یان یەکێیتی! ئەمە سەنگی سیاسی مەسەلەکەی بچوکردەوە بۆ

ئاستی ڕووداوێکی ئاسایی و بێبایەخ، دواتریش بەهۆی بارودۆخی مەزهەبی لەعێراق مەسەلەکە بچووککرایەوە بۆ ئاستی تۆڵەسەندنەوەو خوێن و سەرپەڕاندن، نەك بۆ دابینکردنی عەدالەت. ئەگەر هۆشیارییەکی سیاسیی نەتەوەیی بەهێزی لەپشت بوایە، دەبوایە دادگاییکردنی سەدام و عەلی کیمیایی ببێتە فاکتەرێك بۆ ئەوەی شایەدحاڵ و قوربانییەکان گوتارێك تۆمار بکەن کە ببێتە گوتاری نەتەوە، گوتاری کورد بۆ ماف و ئازادیی و سەربەخۆیی.

**پرسیار:** ئەو پێشنیارە تایبەتیانەی ئێوە چین، بۆ ئەوەی ئەنفال وەك کارەساتێکی سیاسیی مێژوویی لەیادوەری ئینسانی کورددا بەچەشنێك بمێنێتەوە کە هەمیشە جێی ئاوڕدانەوەو قسەکردنبێت لەسەری لەلایەن ئەو نەوانەی کە لەدوارۆژی کۆمەڵگەی ئێمەدان؟

**نەزەند بەگیخانی:** بۆ ئەوەی ئەنفال وەکو کارەساتێکی مێژوویی جێگیربێت، پێویستە لەسەر ئاستی تاك بگوازرێتەوە بۆ ئاستی گشتی و نەتەوەیی، واتە بەرەو بەکولتوری یادەوەری گشتی (collective memory) بدرێت و ئەنفال لەیادەوەری گشتیدا جێگیر بکرێت. دواتر دەبێت بزانین کە ئەنفال تاوانە دژی مرۆڤایەتی و دەبێت لەسنوری ئێتنیکی و نەتەوەیی کوردو جوگرافیای کوردستان بچێتە دەرەوەو ببێتە مەسەلەیەکی کۆسمۆپۆلیتان و بەجیهاندا بڵاوبکرێتەوە، واتە بکرێتە بنەمایەك بۆ لێکدانەوە و تێگەییشتن لەجینۆسایدو پاکتاوی ڕەگەزی



لەسەرانسەری جیهان. پێویستە ئەنفال بهێنرێتە ئاستی هۆلۆکۆست و هۆلۆکۆست بەکاربهێنرێت بۆ تێگەییشتن و دیاریکردنی سیاسەتی جیهانی بەرامبەر بەکورد بەجۆرێك کە کاریگەریی هەبێت لەسەر مافی مرۆڤ و ئازادیی و دادوەری. کێ دەتوانێت ئەمە بکات؟ ئەمە ئیرادەیەکی بەهێزی سیاسیی پێویستە هاوتا لەگەڵ لۆبییەکی کوردی بەهێز لەوڵاتانی دونیا کە کێشەی کورد ببەنە پێشەوە.

دروستکردنی کولتوری یادەوەریی لەناو کورد و لەمەڕ ئەنفال زۆر گرنگ و پێویستە، چونکە لەگەڵ زەمەن شایەدحاڵەکانی ئەنفال نامێنن، بۆ ئەوەی ڕووداوەکە لەگەڵ شایەدحاڵەکان نەمرێت، دەبێت لەیادەوەری گشتیی کوردیدا جێگیربێت و هۆشیاریی مرۆڤی کوردی لەسەر هەڵچنرێت. ئەمەش واتە ئەنفال لەیادەوەری تاکەوە، تاکی قوربانی، بگوازرێتەوە بۆ یادەوەری گروپ، یادەوەری گشتی، هی نەتەوە. چونکە هەروەکو مۆریس هالبۆچ لەکتێبی 'دەربارەی یادەوەریی گشتی' دا دەڵێ: 'تاك کاتێك دەتوانێت یادەوەری بژێنێتەوە کە تەجاوزی سنوری ئەزموونی تایبەتیی خۆی بکات و لەناو ڕوانینی گروپ و خەیاڵی گشتیدا خۆی ببینێتەوە'▯ دەبێت ئەزموونی قوربانییەکانی ئەنفال ببێتە ئەزموونی گشت، ڕابردووی تاکەکان ببێتە ڕابردووی هەموو نەتەوەی کوردو ڕووداو و

▯ .Halbwachs, Maurice, *On Collective Memory*, Chicago: University of Chicago Press, 1992.

کارەساتەکان ببنە کارەساتی هەموان. ئەمەش واتە بنیاتنانەوەی رابردوو بەو ئامرازو زانیارییانەی کە لەئێستادا هەن و وەردەگیرێن. دیارە ئەمە پێویستی بەبەکارهێنانی سەرگوزەشتەو شایەدی و بەڵگەی ئەوانە هەیە کە راستەوخۆ لەکارەساتەکەدا ژیاون بەدەر لەناڵانەوەو شین و واوەیلا کە دەسەڵات و میدیای کوردیی لەدەوری دەخولێتەوە. دەبێت ئەوەش بزانین کە بنیاتنانی یادەوەریی گشتی تەنها لەم کەرەستانە، واتە لەسەرگوزەشتەو شایەدی و بەڵگەی ئەوانەی کە راستەوخۆ کارەساتەکە ژیاون پێك نایەت، بەڵکو پەیوەندیی ئەخلاقی و عاتیفی ئێمە لەگەڵ رابردوو هەروەها ئیرادەمان بۆ دارشتن و تۆمارکردنی ئەو یادەوەرییە رۆڵی گرنگی تێدا دەبینێت. بێگومان یادەوەری گشتی جیایە لەمێژوو" مێژوو بریتییە لەتۆمارکردنی رووداوەکانی رابردوو و پەیوەستە بەرابردووەوە، بەڵام یادەوەری گشتی ئەو رابردووە لەهۆشیاریی گروپ و لەئێستادا بەزیندوویی دەهێڵێتەوە. ئەمە پرۆسەیەکە کە دەبێت یادەوەری گشتی و تایبەتی و ئیرادەی سیاسیی پێکەوە کۆبکاتەوە، لێرەدا هەروەکو لەهەڵەبجە لەساڵی 2005دا بینیمان و ئێستاش دەیبینین گرژی و بەربەرەکانێ دروستدەبێت لە نێوان ئەوانەی کە راستەوخۆ کارەساتەکە ژیاون (خەڵکی هەڵەبجە) ئەوانەی کە لەهۆشیاریاندا زیندووەو وەکو گروپ و گشت تاوتوێی لەگەڵدا دەکەن (هونەرمەندو نووسەر و شاعیر و رۆژنامەنووس و لێکۆڵەر، واتە ئینتەلیجنسیای کوردی) و هەروەها لەگەڵ دەسەڵاتدار.



باسکردن لەئەنفال و دروستکردنی کولتوری یادەوەری گشتیی دەبێت دوو ئاستی هەبێت: لەرووی سایکۆلۆژی تاك و لەرووی مێژوویی سیاسییەوە. لەرووی سایکۆلۆژی و کۆمەڵایەتی و ئاستی تاکەوە قوربانیانی ئەنفال خراونەتە پەراوێزی کۆمەڵگەوەو تەنها لەیادی ئەنفالداو لەشین و پرسەدا باسیان دەکرێت. ئەو کوردەی کە خۆی کارەساتەکانی ئەنفال نەژیاوەو نەبینیوە، بێباکە بەرامبەر ئەنفال، لەوانەیە لەرووی عاتیفییەوە کاتێك شایەتحاڵێك دەبینێت سەرگوزەشتەی خۆی دەگێرێتەوە، بورووژێت، بەڵام ئەو ئەنفال بە قەزیەی خۆی نازانێت و هاوسۆزی و پشتگیریی بۆ قوربانیان وەکو پێویست نییە. ئەمەش بەپلەی یەکەم لەبەرئەوەیە کە دەسەڵاتی کوردی و ئینتەلیجنسیای کوردی هێزێکی ئیپیستۆمۆلۆژیی و هۆشیارییەکی سیاسی– نەتەوەیی پتەویان لەمەڕ ئەنفال نییەو کاریان بۆ نەکردووە.

دەسەڵاتی کوردی تائێستا مامەڵەی لەگەڵ ئەنفال لەسەر دوو ئاست بووە: ئاستی یادکردنەوە کە خۆی لەپرسەو شین و تەغتیەی میدیادا نواندووە لەگەڵ ئاستی ماددی و قەرەبووکردنەوە. بەڵام با لەخۆمان بپرسین ئایا یادکردنەوەی ئەنفال بۆ کێیە؟ کێ پێویستی بەیادی ئەنفال هەیە، قوربانییەکان یان مرۆڤی کورد بەگشتی؟ قوربانییەکان برینەکانی ئەنفالیان لەناو خۆیان هەڵگرتووەو رۆژانە لەگەڵیدا دەژین، ئەوان پێویستیان بەیاکردنەوە نییە، ئەو رۆژی یادکردنەوەیە دەبێت بۆ دروستکردنی هۆشیارییەکی سیاسیی کوردیی بێت لەبەرامبەر ئەنفال.

کورد دەبێت یادی ئەنفال بکاتەوە وەکو کارەساتێکی مێژوویی کاریگەر لەسەر نەتەوەی کورد. دەبێت ڕووداوەکە لەڕووداوی تاکی قوربانییەوە بگوازرێتەوە بۆ ڕووداوی نەتەوەو ببێتە کولتور، کولتوری یادەوەری گشتی. ئەنفال و میکانیکیەتی کارەساتەکە دەبێت لەبەرنامەکانی خوێندن و پەروەردەو یاسادا جێگیربکرێت بۆ دروستکردنی شوناسێکی گشتی لەمەڕ ئەنفال.

لەسەر ئاستی ماتێریالی، دیارە قەرەبووکردنەوەی قوربانیان و چاککردنی بارودۆخی ژیانیان و پێشخستنی گوزەرانیان زۆر پێویست و گرنگە، بەڵام دەبێت هاوتا لەگەڵ ئەو بایەخە ماتێریاڵیە، خۆشگوزەرانی دەروونی و ڕۆحیش دابینبکرێت. واتە دەبێت قوربانیانی ئەنفال پشتگیریی دەروونییان بۆ دابین بکرێت و هاوکاری بکرێن بۆ سارپێژکردنی برینە ڕۆحی و سایکۆلۆژییەکان کە بەتەنها بەپارە چارەسەر ناکرێن. ئەو فەراغە ڕۆحی و سایکۆلۆژییە بۆتە هۆی ئەوەی کە خەڵکێکی زۆر خۆی لەئایدیۆلۆژیای حزبە ئیسلامیەکاندا بدۆزێتەوەو بچێتە ژێر باڵی ئەوانەوە کە یاری بەهەست و سۆزیان دەکەن. جگە لەمانە، دەبێت ئەنفال ببێتە بنچینەیەکی مۆرالی–یاسایی بۆ داواکاریی کورد بۆ قەرەبووکردنەوەو دابنیکردنی مافی قوربانییەکان، نەك تەنها بۆ پارە بەخشینەوەو زیادکردنی حەزی خەرجکردن و ئارەزووی بێسنوری بەفیڕۆدان و دروستکردنی دیاردەی مشەخۆری کە خەریکە لەکوردستان



پەرەدەسێنێت، بەڵکو بۆ شەرعیەتدان بەمافی کورد لەئازادیی و سەربەخۆیی و دروستکردنی دەوڵەت.

**پرسیار:** ئایا ئەدەبی کوردی بەتەعریفە جیاوازەکانی ئێوەوە بۆ ئەدەب چەند بەرپرسیارە لەبەردەم بیرنەکردنەوە لەئەنفال؟

**نەزەند بەگیخانی:** دروستکردنی کولتوری یادەوەریی گشتی ئەرکی هەمووومانە، ڕاستە ئەرکی سەرەکی دەکەوێتە سەر دەسەڵاتی سیاسی بۆ دروستکردنی هۆشیارییەکی نەتەوەیی لەمەڕ ئەنفال و جێگیرکردنی لەبەرنامەکانی پەروەردەو فێرکردن و یاسادا، بەڵام تاکی کورد، بەتایبەتی ئەوەی کە هۆشیارەو درك بەڕاستییەکان دەکات و ئامرازی تۆمارکردن و گێڕانەوەی ڕووداوەکانی لەدەستە، مەبەستم هونەرمەندو نووسەرو شاعیرو ڕۆژنامەنووس و لێکۆڵەرو ئەکادیمی کوردە کە من لێرە بەئینتەلیجنسیای کوردی ناوی دەبەم، ئەرکی زۆری دەکەوێتە ئەستۆ، بەتایبەتی لەسەر ئاستی جیهانی. ئەوەی شیعرێك یان تابلۆیەك دەریدەبڕێت کاریگەریی پتەوتری هەیە لەسەر خەیاڵی گشتی لەوتارێکی ڕۆژنامەنووسی و سیاسیی ڕووت لەمەڕ کارەساتەکە. ئەمە لێپرسراوییەتێکی مێژوویيەو هەمووومان دەگرێتەوە. دەربڕینێکی ڕاستەقینە لەڕووداوەکانی ئەنفال لەسەر ئاستی هونەریی و ئەدەبی واتە گواستنەوەی ڕووداوەکە لەتاکێکەوە بۆ گروپێك و دروستکردنی هۆشیاریی نەتەوەیی و نێونەتەوەیی بەرامبەر بەماف و

ئازادیی مرۆڤی کورد بەتاك و نەتەوەوە. من لەڕێگای دیوانێکم، دیوانی زەنگوڵی وتن، کە ساڵی 2006 بەئینگلیزی بڵاوبۆوە، لەناکاو خۆم بینییەوە لەرادیۆی بی بی سی و پەرلەمانی بەریتانی و فێستیڤاڵە شیعرییە جیهانییەکان بوومە شایەتحاڵێکی جینۆساید، ئەمەش کاریگەری هەبوو لەسەر دروستکردنی هۆشیاریی لەمەیانی خەڵکێکی زۆری بیانی. ئەمە ئەرکی ئێمەیەو ئەگەر وەسیلەو ئامرازمان هەبێت و پێی هەڵنەسین، ئەوە نەك تەنها کەمتەرخەمین، بەڵکو تاوانباریشین.

بەداخەوە ئینتەلیجنسیای کوردی نەگەیشتۆتە ئاستی لێپرسراوی بەرامبەر بەئەنفال. ئینتەلیجنسیای کوردی لەحاڵەتی بەستن و نەجووڵان دایەو خەریکی دیاریکردنی شوناسی خۆیەتی لەبەرامبەر تورك و فارس و عەرەب، واتە لەبەرامبەر داگیرکەر خەریکی دیاریکردنی کوردبوون و کوردایەتییەو لەم پرۆسەیەشدا زۆر کەم رۆشنبیرمان هەن کە تەجاوزی عەقڵیەتی ئەی رەقیبیان کردبێت، واتە عەقڵیەتێکی پەنماو بەسۆزی کوردایەتی کە لەبەرامبەر ئەنفال و بەرەو دروستکردنی کولتوری یادەوەری گشتی لەمەڕ ئەنفال کاریگەر نییە. ئەگەر سەیری ئەم چەند ساڵەی رابردوو بکەین، دەبینین ئەو ماوەیەی کە زۆرترین بابەت لەلایەن کوردەوە لەسەر ئەنفال نووسرا ئەو کاتە بوو کە هەواڵی فرۆشتنی چەند ئافرەتێکی کورد بەمیسرو بەکارهێنانیان لەمەلهاکاندا بڵاوبۆوە. ئەمە هەواڵێکی دڵتەزێن بوو و دیارە من نکوڵی لەدڵسۆزیی نووسەرانی ئەو گوتارە ناکەم، بەڵام ئەو گوتارە پڕ بوو لەعاتیفەو تووڕەیی و رق و وشەی پەنما، کە دەربڕی کولتوری شەرەف و ناموس و هەستکردن



بەئابڕووچوون بوو لەبەرامبەر ئەوەی کە ژنانی کورد فرۆشراون و رۆژانە تەعەددای سێکیسیان لێدەکرێت کە دەبێتە مایەی بێشەرەفی بۆ گروپ و نەتەوە. فرۆشتنی ئەو ژنانە وەکو هەر رووداوێکی دیکەی ئەنفال بەشێکە لەپرۆسەی جینۆسایدو ئەگەر فاکتەری کولتوری شەرەف نەبێت کاریگەرتر نییە لەچیرۆکی ئەو دایکەی کە لەزیندان چەند منداڵێکی لەبرسان دەمرن و یەکێك لەمنداڵەکانی پێش مردن داوای خەیار دەکات. دایکەکە دەڵێت: ئێستاش کە بۆنی خەیار دەکەم سەرم دێتەژان و دەکەوم. ئەو گوتارەی ئاماژەم بۆ کرد زیاتر خۆ بەتاڵکردنەوەیەوەو کوشتنی فیکرو عەقڵانییەتەو مەودای کولتوری شەرەفیش لەلای ئینتەلیجنسیای کورد دەگەیەنێت نەك بەتەنگەوەهاتن بۆ دابینکردنی ماف و دادوەری. رۆشنبیری کورد دەبێت بەخۆیدا بچێتەوەو خۆی لەو جۆرە گوتارە رزگار بکات. ئەمە لەلایەك، لەلایەکی دیکە، ئیمڕۆ رۆشنبیری کورد دابەشبووە: یان لایەنگیری تەواوی دەسەڵاتەو بەهەمانشێوەی دەسەڵات گوتاری خۆی لەمەڕ ئەنفال دادەڕێژێت و پاکانە بۆ سیاسەتی کوردی لەبەرامبەر ئەنفال دەکات و زیاتر خەریکی بەئەفسانەکردنی سەرکردەکانە نەك قەزیەی کورد، یان بەتەواوی دژی دەسەڵاتەو لەڕەخنەگرتندا بوار بۆ لێکدانەوەو دیالۆگ و خوێندنەوەیەکی ئۆبژێکتیڤانەی کۆمەڵگەی کوردی ناهێڵێت و لەجەمسەرە توندەکانی هێرش و مۆنۆلۆگ تێناپەڕێت، لەنێوان ئەم دوو هەڵوێستەدا، من فەشەلی ئینتەلیجنسیای کوردی دەبینم.

**پرسیار:** ئایا ئاستی ئەو ترسە شاراوەیەی لای ئینسانی کورد هەیە بەرامبەر کوردبوونی خۆی، ترسێکە خاوەنی هێزیکی رۆشنبیریی وایە کە بتوانێت لەبری تۆڵە، خۆی بکات بەهێزێك کە هەڵگری لێبوردن بێت. ئایا ئەم هێزە چەند دەستەڵاتی کوردی لێی بەرپرسیارەو چەندیش کۆمەڵگەی کوردی و رۆشنبیرەکانی بەرپرسیارن لەپیشاندانی؟

**نەزەند بەگیخانی:** پێویستە لێکدانەوەمان بۆ ئەنفال لەهاوکێشەی هێزو دەسەڵات قەتیس نەمێنێت. ئێمە پێویستیمان بەهێزێکی مەعریفی کوردی هەیە، کە بتوانێت تەجاوزی ترس و هاوکێشەی هێزو دەسەڵات بکات و رووداوەکان وەکو خۆیان بهێنێتە گۆو لەداهێنانی هونەریی و ئەدەبی بەرجەستەیان بکات. ئەمەش پێویستی بە رۆشنبیرییەکی کوردیی فراوان و مەدەنی و چالاك هەیە کە گوتارێکی خاوەن دەسەڵات لەرووی زانینەوە دابرێژێ تا ئەنفال نەك تەنها لەسنووری نەتەوەیی کوردو جوگرافیاو کوردستان بباتە دەرەوە، بەڵکو وەکو پرینسیپێك بیناسێنێت بۆ دابنینکردنی مافی مرۆڤ و ئازادیی و بیکات بەبنەما بۆ ناساندنی جینۆساید لەسەر ئاستی جیهانی. ئەوەی هۆلۆکۆستی گەیاندۆتە ئەو ئاستەی کە باسمانکرد زانین و دەسەڵاتی گوتارە هەم لەسەر ئاستی دەوڵەتی ئیسرائیل و هەم لەسەر ئاستی ئینتەلیجنسیای جوولەکە.

نووسەران تەنها هۆشیاری لەسەر ئەنفال دروستناکەن، بەڵکو مۆدێلی گوتارێکیش دادەهێنن بۆ قسەکردن لەسەر تاوانەکان، لەسەر



قوربانییەکان، لەسەر پرۆسەکە بەگشتی و بکەرانی جینۆساید. ئەم کارە پێویستە لەداهێنانی تاکە کەس قەتیس نەکرێت و بکرێتە پرۆژەی لێکۆڵینەوەو دامەزراندنی سێنتەری تایبەت بەئەنفال و تیۆری جینۆساید نەك تەنها لەسەر ئاستی کوردو کوردستان، بەڵکو لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی. رۆشنبیری کورد ئەگەر نەتوانێت پڕۆژەی وەك گۆڤاری هۆلۆکوست و لێکۆڵینەوەی جینۆساید دابمەزرێنێت، کە ئیمرۆ یەکێکە لەگۆڤارە نایابەکانی تایبەت بەهۆلۆکۆست و جینۆساید کە پرۆفیسۆرو لێکۆڵەری جیهانی بەڕێوەیدەبەن، ئەوا دەبێت کار بکات بۆ گەیاندنی دەنگی کورد بەو کەناڵانەو داڕشتنی گوتار لەسەر ئەنفال تیایاندا.

کوردبوون وەکو ناسنامە حاڵەتێکی چەسپاو نییەو بەپێی ژینگەی سسیاسیی و کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری لەجووڵەو گۆڕاندایە. ترس لەناسنامەی خۆمان بەڕای من پابەندە بەنەزانیی و داخراویی و ناشارەزایی لەجیهانی دەرەوە. زانین نزیکمان دەکاتەوە لەحەقیقەت و کلیلی دەرگای زۆربەی کێشەکانە، بەڵام زانینێکی مرۆڤانەو بێلایەن. ترس لەناو خودی سەربەزانین و تێگەییشتنی فراوان بۆ جیهان و دەوروبەر جێگای نابێتەوە، بەڵکو باوەڕبەخۆبوون و هەڵسەنگاندنی پۆزەتیڤ بۆ خودو شوێنی دەگرێتەوە کە یارمەتی تاك و گروپ دەدات خۆی بێت و بەبێ سڵەمینەوە گوتارێکی راست و دروست دابرێژێ لەسەر خۆی و ئایدیاکانی لەرەفتارو کردەوەکانیدا جێگیر بکات. تەجاوزکردنی رق و کینەو تووڕەیی وادەکەن کە لەگەڵ خۆمان ئاشتبینەوە. ئەم تووڕەییە زۆرجار لەهەستکردن بەنادادوەریی و بێدەسەڵاتییەوە دێت، هەروەها

لەهەستکردن بەکەمیی و نەتوانین و تێگەییشتنی پێویستمان بۆ واقیعی دەوروبەرمان. ترس و رق و بەربەرەکانێ ڕێگرن لەبەردەم لێبوردەیی و بەخشین و ڕێگا خۆشدەکەن بۆ تۆڵەسەندنەوەو بێباکیی کە خزمەت نە بەخۆمان وەکو تاك و نەتەوە نە بەقەزیەکەش کە ئەنفالە دەگەیەنێت. لێبوردن و بەخشین پرۆسەیە دەبێت چەشنی پرۆژەیەك کاری لەسەر بکرێت، هۆش و بیرکردنەوەی لەسەر ڕابهێنرێت، هەروەکو دەلای لاما دەڵێت، دەبێت عەقڵی لەسەر ڕابهێنین. کولتوری لێبوردن و بەخشین لەلای کورد وەکو پێویست کاری لەسەر نەکراوە، بەداخەوە کولتوری تۆڵەسەندنەوەو توندوتیژیی و خوێن و شەرەف زیاتر برەوی هەیە. ئەمەش لەوانەیە مەبەستە کاتی و بچوکەکانمان تێر بکات، بەڵام نامانگەیەنێتە ئامانجی گەورە چ لەسەر ئاستی تاك و چ لەسەر ئاستی نەتەوە.

کۆتایی



# کازیوە ساڵەح

**گەر لەئاییندا بۆ مەرگدۆستیی بگەڕێین، پێویستە لەمەسەلەی ئەنفالدا تەنها بگەڕێننەوە بۆ ئاینی ئیسلام، چونکە ئیسلام ئایینی هەموو داگیرکەرانی کورد بووە.**

**گەر چەمکی ڕۆشنبیریی چەمکێکی کارا بوایە لەناو کۆمەڵی کورددا، چەمکی تۆڵەکردنەوە لاواز دەبوو.**

کازیوە ساڵەح



**پرسیار:** ئەگەر بهاتایە ئەنفال لەوڵاتێکی ئیسلامیدا روویندەدایەو هەروەها مانایەکی ئیسلامیشی پێنەدرایە، پێتانوابوو ئەنفال بتوانرایە نوقمی بێدەنگییەکی وابکرێت، هەم لەلایان وڵاتانی دراوسێوە تا دەگاتە هەموو وڵاتە ئیسلامییەکانی دنیا، ئەوسا وڵاتانی ئەورووپاش.

**کازیوە ساڵەح:** ئەگەر ئەو تاوانە گەورەی بەعس لەئەنفالدا بەرامبەر کورد ئەنجامی دا بەتاوانی میکافیلیەت و کەسێتی سەدامیش بەمیکافلیەزمی ناوزەد بکەین، ئەو کەسێتییەی لەسەردەمی شکسپیردا بۆ تاوانباران هاتە نێو چەمکە فکرییەکانەوەو دواتر شکسپیر لە" ماکبێت "دا بەرجەستەی کرد، ئەوا هەموو دەقە ئەدەبی و فکرییەکان بۆمان دەردەخەن کە میکافیلیەت، سادیەت و نیکرۆفیلیزم سێ چەمکن گوزارشت لەخوێنڕشتن و مەرگ دۆستی دەکەن، لەسەردەمی ستالین و هیتلەردا گەشەیان کرد و کەوتنە بەر بیستی خەڵك، بەڵام تەنها وەکو سێ کارەکتەری سیاسی نا، بەڵکو وەکو سێ نەخۆشی دەروونیی زۆر سەختیش کە لەزانستی دەروونیدا چارەسەریان سانا نییە. ئێمە کاتێك ئەو چەمکانە گرێدەدەینەوە بەئەنفالەوە، پێویستە بەدوای سێ کایە بگەڕێین بۆ ئەو چەمکانە، ئەوانیش کایەی ( ئایینیی، مێژوویی، کەلتووریی و باری دەروونیی لای کوردو داگیرکەرانی ).

**یەکەم:** گەر لەئایندا بۆ مەرگ دۆستی بگەڕێین، پێویستە لەمەسەلەی ئەنفالدا تەنها بگەڕێننەوە بۆ ئاینی ئیسلام، چونکە ئیسلام ئایینی هەموو داگیرکەرانی کورد بووە، بەعەرەب و فارس و تورکەوە. بوونیادی ئایینی ئیسلام تەژیٚ بەرێچکەی خوێنڕشتن و توندو تیژیی و مەرگدۆستی، چەمکی ئەنفال کە لەقورئانەوە وەرگیراوە، ئەوەی لەئەنفالی سەردەمی ئیسلامدا بەرامبەر ناحەزانی ئیسلامی عەرەبیدا کراوە، زۆر جیاوازی نەبووە لەئەنفالی سەردەمی سەدامی عەرەبی لەڕووی میکانیزم و ئامانج و ڕەوایەتیدانەوە. بۆ ئەوەی وەکو مرۆڤە نەریتییەکان بەسۆزەوە لەئایین نەڕوانین و بزانین ئایا ئایینی ئیسلام ئاینێکە ڕەوایەتیدەرە بەمەرگدۆستی یان مرۆڤ دۆستی، پێویستە لەخۆمان بپرسین، ئایا ئایینێکە زیاتر والایە بەڕووی گفتوگۆ بۆ تێگەشتن لەمانای ئایین وەکو چاکسازیی کۆمەلایەتی، یان پێوەرێکی سنووردانانە بۆ نەهێشتنی گفتوگۆو لێتێنەگەشتنی، کە باری دووەم لەپێناوی ئاشکرانەکردنی باری یەکەمدا بەرجەستە بووە، ڕاستییەکی حاشاهەڵنەگرە کە ئایینی ئیسلام تاکە ئایینێکە هیچ بواری گفتوگۆو ڕەخنەو شیتەڵکردن نادات لەپێناوی نەدۆڕانی ناوەرۆکدا، ئەو ترسەش کاتێك دێتە ئاکام، کە ناوەڕۆك بەختەوەری و ژیان دۆستی بۆ مرۆڤەکان لەهەناودا هەڵنەگرتبێت، ئەوەش بێبەهایی مرۆڤ دەکات لەنێو خودی ئایینەکەدا، ڕەوایەتییە بەمەرگدۆستی.



**دووەم:** مێژووی عەرەب مێژووی فتوحاتی ئیسلامییە، ئەو فتوحاتەی خوێنی هەموو ناموسڵمانێك و ناعەرەبێکیان تێدا ڕشت، ئەو فتوحاتەی بەشمشێرو خەنجەر بەهای ملی مرۆڤایەتیان پێوا. ئەو خەنجەرو شمشێرانەی هەتا ئێستاش سەرکردەکانی عەرەب کە بەنوێترین چەك و تەکنەلۆژی سەردەم شەڕدەکەن، بەڵام دیارییەکانی دەستیان بۆ یەکتری هەر خەنجەرو شمشێرە، پشتی سەرەوەیان و لای وێنەکانی خۆیانەوە ئەگەر وێنەی شمشێرو خەنجەری تێدا نەبێت، ئەوا چەند دانەیەکی ڕاستەقینە بەدیوارەکەیانەوە وەکو ڕەمزی عەقڵییەت و شارستانییەت عەرەب هەڵواسیوەو پاراستوویانە. مێژووی کوشتن و جینۆسیادو خوێنڕشتن لەکرسۆماتیاندا جێگیربووە، مێژوویان لەسەر هاوکێشەی مەرگدۆستی خۆی داڕشتووە، سەرەتا لەمیانەی تالانکردنی تیرەکانەوە لەناو یەکتردا چەسپی، بەهێزی ئەو تیرانە لاوازیانی داگیردەکردو ژن ومندال و سەروەت و سامانیانی بۆ خۆی قۆرخدەکردوەو لەناویاندا قورەیشەکان بەهێزتربوون و ئەوانی دییان تالاندەکرد، هەتا پرۆسەی تالانگەری خۆیان پەرەپێدا بۆ تالان "ئەنفال" کردنی ئەو کاروانانەی لەهیندە شمەکیان دەهێنا بۆ میسرو سوریاو فەلەستین، واتە چەتەی بازگەکان بوون، لەوێوە بازرگانیکردنی ژن و منداڵیان داهێنا تا ئاستێك کە بازرگانێك عەرەب قەرزداری یەکێکی بەهێزتریان دەبوو، ژن و منداڵی خۆی داوە لەبری قەرزەکە، ئەو دۆخە بەپەیدابوونی ئایینی ئیسلام پەرەیسەند بوو بەبانـدی چەتەگەری گەورە بۆ هەموو تالانکردن و

ئەتکردنێك ژنان و منداڵان بەهانەیەکی ئایینیان بۆ دۆزیوەتەوە وەکو شەرعیەتپێدان، وەکو ئەو تاڵانییەی نێوان شاری مەککەو تاییف و بەسەردەستەیی عەبدوڵلای کوڕی جەحش، وەکو چەند وشترو باری وشتر پێستەی خۆشکراویان لەتیرەی قورەیش زەوتکردو وەکو سیستمی تاڵانی نێوان تیرەکان و بەشی بەهێز لای لاوازتر پێنجیەکیان دا بەموحەمەدی پێغەمبەری عەرەب. پاش ئەو تاڵانییەو لەتاڵانی بەنی قەعقاعەوە، ئیتر مافی خۆی بەفەرمی لەتاڵانییەکاندا دەچەسپێنێت بەبەهانەی ئایەتی " فاعلموا انما غنمتم من شی` فان لله خمسه ولقربی والیتامی والمساکین وابن السبیل" دیارە ئەمە تەنها بۆ ئەو تاڵانیانە بوون کە لەشەڕە بەدەست دەهاتن و تاڵانە ئەندەفیدۆڵییەکانی ناو تیرەکان تەنها بۆ کەسی تاڵانکار بوو، هەر ئەو تاڵانییە تاکڕەوانە شەڕی نێوان قەوامیەکانی بەحرێن و بەسرەی بەرپاکرد، سەدان جۆری دی تاڵانی سیستمی باوەڕپێکراو کارپێکراوی ئەو سەردەمەیان بووە. ئەوان لەنێو خودی خۆشیاندا هەر هێمایەك بۆنی شارستانییەتی لێهاتبێت وردو خاشیان کردووە، ئەوەی هەتا ئەمڕۆ عەرەب شانازی پێوە دەکات ئەو شارستانییەتە مێژووییە لەمیسردا بەجێماوە، بەڵام لەڕاستیدا ئەوە شارستانییەتی فیرعەونییەو بەهیچ شێوەیەك مۆرکی عەرەبی پێوە نییە، تەنانەت کاتێك کەوتنە خاپوورکردنی ئەو شارستانییەتە، لەو کاتەدا گەورەترین کتێبخانە لەمیسردا هەبوو کە ژمارەی دە هەزار کتێبی تێدا بوو، ئەو کات عومەری کوڕی خەتاب فەرمانی دا بەسووتانی هەموو کتێبەکان و کتێبخانەکە، لەوەڵامی پرسیارکارانیشدا دەڵێت ئایە ئەو



دەهەزار کتێبەی لەو کتێبخانەدایە هیچیان لەقورئان بەنرخترن، بێگومان بەعەقڵی ئەوان نەخێر، کەواتە ئێمە خاوەنی بەنرخترین کتێبین لەگێتیدا و نابێت کتێبی دی هەبێت جگە لەقورئان. لێرەوە دەبینین لەناوبردنی هەموو بەهایەکی جوان و خوێنڕشتن لەمێژوو ژیانی عەرەب و گەلانی تری دژە کوردیشدا مێژووی شانازیی بەرهەمهێنانەوەیە.

**سێیەم:** دەروونی موسڵمانانی داگیرکاری کورد. عەرەب و بەعس دەروونی قەبیلگەری و چادر نشین بوون، ئەو هۆشیارییە لاوازەش بەپرەنسیپی شمشێرو خەنجەرو عەرەبسالاری پڕچەك و سازکراوە، عەرەب کە توانیویەتی سەرجەم شەڕە دۆڕاو و براوەکانی بکات، ئەوەش لەو هێزەوە سەرچاوەی گرتووە، کە پێیوابووە ئەو باشترین نەتەوەی جیهانە، چونکە ئایینەکەی دوا ئایینە، لەهەموو ئایینەکانی دی متمانەپێکراوترە، کەواتە دواجار سەرجەم نەتەوەکانی جیهان دەبن بەئیسلام و ئیسلام بوونیش واتای عەرەببوون دەکات، چونکە ئیسلام بەزمانی عەرەبییە، ئەو خۆ بەهەند زانینە توانیوێتی رۆحی شەڕانگێزییان بەسەر نەتەواکانی تردا زاڵ بکات، هەر ئەو کەلتوورو دەروونە نالەبارەش وای لێکردوون هەمیشە لەشەڕدا بن، لەگەڵ رۆژهەڵات و رۆژئاوا، ئیسرائیل و ئەمەریکاو خۆیاندا. جگە لەوەی عەقڵی نەتەوە پەرستی هەندێجار ئایینەکەشی پێ وەلا ناون، تاڕادەیەك عەرەب هەرگیز ناڵێن ئیسلامی عەرەبی هەمیشە گووتوویانە عەرەبی ئیسلامی، واتە نەتەوەیان بەر

لەئایینەکەشیان خستووە. هەردوو جەمسەری نەتەوەو ئایین رووبەرێکی فراوانی سیستمی بەڕێوەبردن و رەوشتی لەناوچەکەدا داگیرکردوە، بەڵام ئایا کورد وەکو نەتەوەیەکی ژێردەست تەنها بەسەریدا سەپاوە یاخود خۆشی هەمیشە ئامادەی وەرگرتنی بووە؟

پێموایە لەبنەمادا ئێمە وەکو کورد میللەتێکین یادوەریمان کاڵەو ناسۆرەکانی خۆمان زۆر زوو لەیاددەکەین و بەسانایش دەستبەرداری ئازارەکانمان دەبین، دەکرێت لەبەر ئەوەی کوشتن و ناسۆر بەشێکی بەرفراوانی مێژووی ئێمەی داگیر کردووە لەڕووی مامەڵەی دەروونناسییەوە، ئەوا فاکتەرێکی ئاسایی بێت، بەڵام لەڕووی کۆمەڵناسی و نەتەوەیی و سیاسیشەوە کورد خۆی کەمتەرخەمبووە لەوەی خۆی بناسێنێت و بەسیاسەتی کۆن و نوێوە بەرهەمهێنەرەوەی فاشیزمی نەتەوەی و دیینی بووە بۆ عەرەب، ئایینی ئیسلام و گەر شارستانییەتێك دروستکرابێت لەناو عەرەبدا لەسەردەمی سەلاحەدینی ئەیوبیدا بوو، ئەو عەرەب و ئایینی عەرەبی رزگارکردو لەخاکی عەرەبدا خوێندنگەو زانکۆو نەخۆشخانەی کردووەو شوناسی خۆی لەیادکرد، ئەو سیاسەتە لەلایەن دەسەڵاتدارانی کوردەوە لەو رۆژگارەوە هەتا ئەمڕۆ هەر بەردەوامبووەو بەرهەمهاتووەتەوە، دەسەڵاتدارانی کورد ئەوەندە سەرسامی نەتەوەو ئایینی عەرەب بوون، سەرجەم رووبەرو چەمکەکانی کەلتووری کوردی سیخناخ بوو بەکەلتووری عەرەبی، کورد هێندە سەرسامی کەلتووری عەرەبی بووە، نازانێت کامە کەلتووری خۆیەتی، کارەساتە هەڵگرانی ئایینی رەسەنی کورد کە ئێزیدییەکانن بەدەستی خودی کورد کوژراون،



ئەتك کراون، لەخاکی خۆیان وەدەرنراون و زۆر پەرچەکرداری نەشیاوی دی، کارەساتە تەنانەت ئەو لاوانەش کە لەئایینی ئیسلام لادەدن و دەچنە سەر ئاینێکی دی، لەبری هەڵبژاردنی ئایینی رەسەنی خۆیان، دەچنە سەر ئایینەکانی دی، ئەمەش لەنەبوونی عەقڵی بەڕێوەبردن و نەبوونی گوتاری سیاسییەوە سەرچاوەی گرتووە. ئێمە تەنها میللەتێکی بێ دراوسێین، تا بەکەلتووری دراوسێکانمان سەرسام بین، بەزۆر خۆمان دەکەین بەدراوسێی داگیرکارانمان، لەکاتێکدا ئێمە خاوەن ماڵین ئەوان هاتوون لێیان داگیرکردووین و سیستمی دەرەبەگ و جوتیاریان بەسەردا پراکتیك کردووین، کەی ویستوویان لەسەر خاك و ماڵ و کشتوکاڵی خۆمان وەدەریان ناوین، کەچی هەر بەزۆر خۆمان پێوە لکاندوون و خۆمان ناوناوە بەشێك لەئەوان. لەمێژووی کورددا یەك جار پارچەیەکی کە باشووری کوردستانە توانی تەنها ببێت بەدراوسێی عێراق نەك بەشێك لەعێراق، دەسەڵاتدارانی کورد ئەو بەشە میراتەشیان تێکەڵکردوەو لەگەڵ سووننەو شیعە بووینەوە بەبراو هەوڵەکانمان خرایە نێو بۆتەی برایەتی کوردو عەرەبێکەوە، کە کورد بەزۆر ئامادەباشیی برایی بۆ دەردەبڕێت و نەیانتوانی لەئەزموونی تەنانەت سەدامی فاشیش بەهرەمەند بن، کاتێك وڵاتێکی زلهێزی وەکو ئەمەریکا بەکاریهێنا، بۆ بەرژەوەندییەکانی خۆی، بەو عەقڵە قەبیلەگەرییەشەوە، چونکە هەستە نەتەوەییەکەی لەپشتەوە بوو، توانی حزبی بەعسی نەك هەر لێ بەهرەمەند بکات، بەڵکو بیگەیەنێت بەلووتکەش، هەموو دەسەڵاتی عەرەبی بکات بەدەسەڵاتی بەعس، غروری خۆشی لێی تێکنەدایە بەهەڵەکردن لەدەستێوەردانی بەرژەوەندی

ئەمەریکا، ئەو ئامانجەی هەیبوو بۆ ژێر رکێف خستنی دوورگەی عەرەبی دەهاتە دی. کورد هەمان هەلی بۆ رەخسا نەك بەهرەمەند نەبوو لێی، بەڵکو ئەوەشی بەخەبات و خوێنی هەزاران هاتە ئاکام برایەوە بۆتەی شمشێرو خەنجەرو ملبڕینی سەدەی بیست و یەکی عەرەب. ئەمە لەکاڵ فامیەوە نەبوو بۆ نەخوێندوەی کارەساتەکان، لەو گووتارە لاواز و هەستە کاڵەوە بوو، کە داواکان هەمیشە دەبەنەوە بەر دەستکەوتە سیاسیی و ئابوورییەکان، ئەمە تەنها باروودۆخی سیستمی بەڕێوەبردن و ئەخلاقی کورد نەبووە، بەرامبەر پرۆژە نەتەوەیی و نیشتمانییەکانی، بەڵکو لەمێژووی کورددا سەکردە هەبووە چاوی کوڕە دوازدە ساڵانەکەی خۆی دەرهانیوە بۆ ئەوەی گەورە بوو جێگەی نەگرێتەوە، ئەوەی ئەمڕۆ روودەدات چاو دەرهێنانی میللەتێکە، چاو دەرهێنان گشتییە لەپێناوی دەستکەوتی گروپێك و چاوی گروپێك.

ئێمە گەر بمانەوێت بەهای ئەنفال بپارێزین، پێویستە رووبەرەکانی گوتاری سەبەخۆو تاکی ئازادبکرێت بەپێوەری کومەڵی ئازاد، پێویستە بەدەیان دەزگا کاریان رزگارکردنی مرۆڤ بێت لەکۆدەکانی ئاییینی، کەلتووری عەرەب، گەڕانەوەی کەرامەتی تاك، هەروەها زیندووکردنەوەو ناساندنەوەی کەلتووری کوردی، هەر کەلتوور گوتاری نیشتمانی نەتەوەی لای تاك بەهێز دەکات، لێرەشەوە بۆ شوناسی مرۆڤ بوونی خۆی دەڕوانێت کە دواجار شوناسی ئەنفالیشی پێ دەپارێزێت، ناکرێت میللەتێك هەتا ئێستا بەشووناسی داگیرکەرانی بسوڕێتەوەو رەهەندە



مرۆیی و خودییەکانی خۆی لەسەر بەرهەمبهێنێت و داوای پاراستنی شوناسی ئەنفالی لێ بکەیت.

**پرسیار:** ئەو هۆکارانە چین کە ئەنفال لەهۆشیارییەکی سیاسی سادەوە کە تەنها لەیادکردنەوەی سەرپێیانەی ساڵانەدا قەتیسبووە دەگوازێتەوە بۆهۆشیارییەکی کەلتووری، لەو بێدەنگییەی کە خاوەنی قسەنییە دەگوازێتەوە بۆ بیرکردنەوەیەك بەدەنگی بەرز.هەروەها ئەم بێدەنگییە چەند پەیوەندی بەکورد خۆیەوە هەیە، هەم لەئاستی بەرپرسیارییەتی کۆمەڵگای کوردی بۆ ئەنفال و هەم لەئاستی دەسەڵاتی کوردی خۆیدا؟

**کازیوە ساڵەح:** پێموانییە ئەنفال هۆشیارییەکی سیاسیشی بەبەر برابێت، ئەو ساڵانە یادکردنەوەیە، هۆشیاریی سیاسی نییە، بەڵکو هۆشیاریی میللیگەراییە، کورد وەکو نەرێتێکی میللی چۆن کەسێك لەماڵەکەیدا دەمرێت ساڵانەی بۆ دەکات، دەچێت بۆ سەرقەبران، ئەنفالیش بەهەمان هۆشیاریی یادی دەکرێتەوە، ئێمە لەبنەمادا خاوەنی گوتاری سیاسی بەهێز نین هەتا خاوەنی هۆشیاریی سیاسی بین، هۆشیاریی سیاسی ئێمە هۆشیارییەکی میللی و دەستەو سانە لەئاست هۆشیاریی سیاسی تەکنەلۆژیی وستراتیژی سیاسیی و بیری بڕیاردەرو بڕیاری زانستیانە، خوازیاربووم یادکردنەوەی ئەنفال لەسەرچاوەی هۆشیاریی سیاسییەوە سەرچاوەی گرتبایە، دیارە ئەو کات ستراتیژی

دریژ خایەن و پلانی لەباریان بۆ ناساندن و قەرەبووکردنەوەی ئەنفال و هێشتنەوەی بەزیندوییەتی لەیادەوەری نەوەی داهاتوودا دەهێشتەوە، یادەکانی سەرپێیانە نەدەبوون، بەڵام نە ئەوەیان کردووە نە دەشبێت بەغەم، چونکە ئەوان هەر لەسەرەتاوە دڵنیان لەوەی جەستەی هەلا هەلاو شکەتی رۆشنبیریی کوردی هەڵگری مەعریفەی بەرهەمهێنان نییە. ئەوەی مەعریفەی کەلەپوور و کەلتووری کورد زیندوو بکاتەوە، لەوانەیە بپرسیت کەلتووری و کەلپووری کورد پەیوەندی چییە بەئەنفالەوە، بەڵام پەیوەندی بەسەرخان و ژێر خانی رۆشنبیریی و شارستانییەتی ئێمەوە هەیە، تا ئێستا شارستانییەت و کەلتووری خۆمان نەناسیوەو بەشارستانییەتی بەدەوی و کەلتووری داگیرکەرانەوە دەمانەوێت بونیادی سەرخانییەکی مەعریفی بنێین لەئاستی کارەساتە باڵاکانماندا، لەکاتێکدا ئێمە کە خاوەنی شارستانییەتی میزۆپۆتامیاو میدیاو خاوەنی زەپۆشە ئایینی و رێبازەکانی زەردەشتی و ئێزیدی و کاکەیی و حەقەین، خاوەنی ئیمارەتەکانین کە کۆمەڵێك کەلەپووریان بەرهەمهێناوەو شارستانییەتیان بەجێهێشتووە، پێویستبوو کەلتوورمانی پێوە گرێبدرێت، شارستانییەتمانی لەسەر بونیاد بنێین، بەڵام نەك هەرهەژاری زانیارین دەربارەیان، بەڵکو هێندە سەرسامی کەلتووری داگیرکەرانمان بووین، کەلتوورە راستەقینەکەی خۆمان بەبێگانە دەزانین، ئەوەی خۆشمان کردووەتە گیرفانی بێگانەوە. هەر میللەتێکیش خاوەنی کەلتووری خۆی نەبوو، خاوەنی کایەی کۆمەڵایەتی دروست و گرێبەندی کۆمەڵایەتی نوێش نابێت. لەنێو ئەو ژاوە ژاوی کەلتووری عەرەبی و ئایینی ئیسلامی و



مامەڵەکردنی کورد لەگەڵ پێشکەوتنی تەکنەلۆژی وجیهانی ئنفۆرماستی بەعەقڵ و مۆڕاڵی میللییەوە، فەرامۆشکردنی مۆڕاڵ و رەوشتی راستەقینەی مرۆڤانەمان بەرهەمدەهێنێت، کاتێکیش مۆڕاڵ فەرامۆشکرا، بەرگری نامێنێت، کە بەرگریش نەما پیرۆزیی نامێنێت، ئەمڕۆ ئێمە گەیشتووین بەئاستی بێبەهاکردنی پیرۆزییەکانمان و داخلیسان لەواتای مۆراڵ، نەك تەنها سەبارەت بەئەنفال وەکو کارەساتێکی هەمیشە زیندوو، بەڵکو هەموو کایە کۆمەڵایەتییەکانمان پێویستی بەشۆڕشی مۆڕاڵی هەیە.

ئەمەو سەرباری هەژاریی و ناهۆشیاریی ئێمە لەچەمکی خود هۆشیاریدا، خود هۆشیاریی لەهەموو رووانگەکانەوە، ئەرمەنییەکان تەنها سێ ملیۆنن، بوون بەخاوەنی دەوڵەتی خۆیان، نەك تەنها لەبەرئەوەی روسیا هاوکاری کردن، لەبەر ئەوەی هۆشیاریی خود هۆشیاریی سیاسی، رۆشنبیریی، زمانەوانی و ئابوورییان هەبوو، ژمارەی ئەرمەنییەکان لەدەرەوەی وڵات زۆر لەکوردەکان کەمترن، بەڵام گەر لەبنەمای هەر ناودارێکی جیهانی لوبنانی بپرسین بەڕەچەڵەك ئەرمەنین، بازرگانە گەورەکان ئەرمەنین، عەقڵێکی بازرگانی زۆر سیستماتکیان هەیە، لەبوارەکانی زانست و زمانەوانیدا بەتەواوی جێگەی خۆیان کردووەتەوە، ئەوەش سیمای نەتەوەی هۆشیارە هەوڵدەدات زۆرترین زمانە بەهێزو زیندووەکانی جیهان بزانێت، خۆشی تەرجەمە بکات بۆ زمانە زیندووەکان، جگە لەیەکگرتوویی و خۆشەویستییان لەناو یەکدا، لەڕووی سیاسی و دبلۆماتیشەوە، هەتا ئەمڕۆ کە گفتوو گۆیان لەگەڵ تورکیا دەبێت دەیبەنە وڵاتانی رۆژئاوا، بەتایبەت وڵاتانی هاوپەیمانی خۆیان و زۆربەی کات

هێزێکی لەخۆیان بەهێزتر دەکەن بەگەواهیدەری گفتوگۆ چارەنووسسازەکان، ئەوەشمان بیرنەچێت، ئەوان توانیان بەپشتگیری روسیا ببن دەوڵەت، هەموومان بارودۆخی خودی روسیاو مێژوویان دەزانین چۆن بووە، بەڵام ئەوان بەرژەوەندییان بەئەرمەنییەکان هەبوو دژی تورکیا، ئەمانیشی بۆ مانەوەو سەربەخۆیی خۆیان بەکاریانهێنان، بەڵام کورد لەبەرئەوەی خاوەنی گووتاری سیاسی جێگر نییە، نەیتوانی بەرژەوەندی ئەمەریکاو بەریتانیا بەبەرژەوەندی خۆی بشکێنێتەوە. لەلایەکی دی ئەرمەنییەکان تەنها نەتەوەیەکی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستن کە بەعەقڵێکی کراوە تێکەڵاوی جیهانی رۆژئاواو رۆژهەڵات بوون، هەر ئەو کرانەوەش کردنەوەی دەرگای فاکتەرەکانی دیشی بۆ ئاسانکردوون. هەموو ئەو فاکتەرانەش کاریگەریی گرنگیان هەیە بۆ بەهای نەتەوەیەك و بەهای کارەساتەکانی لەنێو جیهانی دەرەوەو مەحفەلە نێودەوڵەتییەکاندا، بەڵام کورد خاوەنی ئەو خەسڵەتانە نییە، نموونەیەکی ئاساییت بۆ دەهێنمەوە، زۆربەی کتێبخانەکانی ئەم شارەم بینیوە، هەموو کتێبخانەیەك رەفەی تایبەتی هەیە بۆ نەتەوە جیاوازەکان، هەموو نەتەوەکان بەشی خۆیان هەیە لەسەرجەم کتێبخانەکاندا، ئەرمەنییەکان بەو ژمارە کەمەیانەوە لەهەموو کتێبخانەیەکدا بەشی جیاکراوەیان هەیەو بەسەدان کتێبیان لەو کتێبخانانەدا داناوە، کورد تەنها لەکتێبخانەی گەورەی شاردا پازدە تا بیست کتێبێکی هەیە، خۆم سێ ساڵ بەر لەئێستا کتێبم بەهەمان کتێبخانە پێشکەشکردووە، ئەمساڵ دوو دانەیان خراوەتە سەر رەفەی کتێبە کوردییەکان، کە لێیان دەپرسیت بۆ هێندە



دواکەوت پێت دەڵێن ئەو کەسە کوردەی کە کارمان بۆ دەکات و پێویستە رەزامەندیی بنوێنێت لەسەر دانانی کتێبەکەو کاتێکی زۆری دەوێت، ئەمە لەکاتێکدا فەرمانبەری نەتەوەکانی تر تەنها لەماوەی کەمتر لەهەفتە راپۆرتی خۆی دەنێرێت و چەندین کتێب دەخاتە نێو کتێبخانەکەوە، هەروەها بۆ نەبوومی کتێبی کوردیش رەخنەیان ئەوەبوو کە خوێنەری کوردیان نییە، دەیانەوێت ئەوانەشی لەوێدان لایبەرن، بۆ ئەوەی جێگای کتێبی تریان لێنەگرێت، بۆیە زۆر جار ناچارم ئەو کتێبە کوردییانە کە چەند جارم خوێندونەتەوە بەناوی خوێندنەوە لەو کتێبخانەیە وەربگرم و پاش چەند رۆژێك بیانگەڕێنمەوە بۆ ئەوەی ئەو تەنها رەفە بچووکەش لەکورد وەرنەگرنەوە. ئەوە بارودۆخ و رەوشت و عەقڵی خود هۆشیاریی کوردە بەراوورد بە نەتەوەکانی تر، ساکارترین ئەرك کە بردن و داواکردنی کتێبە ئەگەر نەشیخوێنێتەوە تەنها وەکو جێگیرکردن و پاراستنی سەرمایەیەکی نەتەوەیی و کەلتووری خۆی لەنێو کەلتووری جیهاندا، بەڵام ئەو هەستانەمان زۆر لەوە لاوازترە رێگە پیشاندەرمان بێت بۆ خۆ چەسپاندن و جێگەبوونەوە. ئەو هەست هەژارییەش ناتوانێت لەئاستی کارەساتە گەورەکاندا رێچکە شکێن بێت. مرۆڤ بۆ ئەوەی خاوەنی هۆشیاریی کەلتووری بێت، پێویستە خاوەنی هۆشیاریی ئازادیش بێت، بەواتای دەرچوو لەگۆشەگیریی، کە پرۆژەی خوود خۆشویستنی بۆ دەگێڕێنێتەوە، خوود خۆشویستنیش بەشێکی لەپاراستنی ئازادییە تاکییەکاندا فەراهەم دێت، بەشەکەی دی لەبینینی جیهاندا بەزیندوویی، لەگەشبینی بەوەی کۆهەوڵ دەتوانێت بەشە مردووەکان زیندوو بکاتەوە،

یان لانی کەم دەتوانێت بەشە زیندووەکان بەزیندوویی بهێڵێتەوە، مرۆڤی راست لەسەرەتادا بەهەست خۆی ئازاد دەکات، کوشتنی هەر فاکتەرێك لەفاکتەرە گەورەو بچووکەکانی ژیان بەهەموو چەمك و پرەنسیپەکانەوە واتای کۆیلەیی دەکات، مرۆڤی کۆیلەیە، کۆیلە نازانێت هیچ بژیەنێتەوە، کۆیلە ناتوانێت ئازاد بێت، مرۆڤ ئەگەر جەستەو زمانیشی ئازاد نەبوو عەقڵ و رۆحی ئازاد بوو لەهەموو شت کەمتر بیر لەمردن دەکاتەوە، دانایشی لەبیرکردنەوەدایە لەژیان و زیندووکردنەوەی بەشە مردووەکان نەك مردن، بەڵام کۆمەڵی ئێمە لەو داناییەو هەلومەرجەکانی بێبەرییە.

**پرسیار:** ئەو پێشنیارە تایبەتیانەی ئێوە چین، بۆ ئەوەی ئەنفال وەك کارەساتێکی سیاسی مێژوویی لەیادوەری ئینسانی کوردا بەچەشنێك بمێنێتەوە، کە هەمیشە جێی ئاوڕدانەوەو قسەکردنبێت لەسەری لەلایەن ئەو نەوانەی کە لەدوارۆژی کۆمەڵگەی ئێمەدان؟

**کازیوە ساڵەح:** یەکەم پێشنیارم پابەندە بەگۆڕینی پەروەردەی نیشتمانی ئێمە کە تا ئێستا پەروەردەیەکی سیاسییە، پەروەردەیەکی ژیاریی و کۆمەڵایەتی نییە، هەر کاتێکیش سیاسەت بەهایەکی خستە ژێر رەحمەتی خۆییەوە، ئیتر کۆی ژیان دەبێت بەنمایشێکی کۆمیدی، کۆمیدیایەك جیاواز، کۆمیدیایەك دەتوانێت پێکەنین و گریان کۆبکاتەوە. ترسناکترین کۆدیش کە عەقڵ و هزری ئێمەی داماڵیوە لەوەزیفە مرۆیی و شارستانییەکانی، سیاسییەکانیشمان سیاسەتی رامکردن و



دەستەمۆکردنی دیدەبینی کۆمەڵی کردووە بەئامانج، بەئاراستەیەك کاری لەسەر کردووە کۆی کەسیەتی دارێژراوی خواستێکی سیاسییانەی و تاکی کورد بووە بەو بوونەوەرە سیاسییانەی لەسەر جەستەی رزیوی سیاسەتی کوردی جگە لەشوناس و پێناسی سیاسی، یان بوونەوەرە سیاسییەکان، هەڵگری شوناسی مۆدێرنی مرۆڤانە نین. جگە لەوەی هیچ پرۆسەیەکی سیاسی کوردی کۆن و نوێ ئەو رەوتە دیموکراتییەی بەخۆوە نەبینیوە، هاوڵاتیش بکرێت بەبەشێك لەپرسی بەڕێوەبردن و پنتە ژیاریی و ژیانییەکان، هەتا هەست بەبەرپرسیارییەتی بکات و بەرگریکردن لەبەرانبەر لای ببێت بەمۆراڵ. ئەو سیاسەتسالارییەش تەنها ئەزموونی دوای راپەڕینی لەقاڵب بەر تەسکیدا نەخنکاندووە، بەڵکو درێژکراوەی ئەزموونی لەمێژینەی کوردە لەو بوارەدا، ئەزموونێك هێندە کورتیهێناوە هەمیشە دەرئەنجامەکانی کەڕەتی سفر کردووین، جگە لەنابەرپرسیارییەتی هێندەی ئومێد بەرهەمنەهێناوە ئەو دەرئەنجامەش هاوکێشەیەکی نەزانراو نەبووە لای نەتەوە چەوسێنەرەکانی کوردو هاوکارییەکی باشی پلانە دژەکانی کردوون. لەسیاسەتی جیهانیشدا هەروایە بۆ ئەوەی شارەزای ئاوەزو هزری میللەتێك بین، پێویستە شارەزای فەلسەفەی فەرمانڕوایی سەرکردەکانی بین، ئەوە میللەتە رێگەی پراکتیکی ئەو جۆرە ئایدۆلۆژییەی دەدات. جیرار دولۆدەل پرۆفیسۆر لەزانکۆی بیربینیانی فەرەنسی و پسپۆڕی بواری سیاسەتی ئەمەریکا پێیوایە "ناتوانرێت جیاوازی بخرێتە نێوان فەلسەفەی ئەمەریکی و ئایدۆلۆژی ئەمەریکی، بۆ ئەوەی سیاسەتی سەرکردەکانی ئەمەریکا بزانین

پێویستە ئەو فەلسەفەو پاڵنەرە قوڵانەیان بزانین کە دەیانجوڵێنێت، هەروەها نۆرمی کردار و پڕچەکرداریيان" .کردارو پەرچەکردار ئەو دوو فاکتەرەن چارەسەری کێشە ئۆرگانییەکان دیاریدەکەن، جگە لەدیاریکردنی نەزمی ژیانی هاوڵاتیان لەگەڵ رووداو ئەرێی و نەرێیەکانی رۆژانەیاندا. فەلسەفەی سیاسی کورد ئایدۆلۆژیای فەندەمنتاڵی هۆزە، کردارو پەرچەکردارەکان تەنها لەئاستی سەرەك هۆزدا قەتیس دەمێنێت و هاوڵاتی بواری پەرچەکرداری نەدراوە تا لەمیانەیەوە ببێت بەخاوەنی مۆراڵی ئەرك، هەتا ئێستا لەنێوان حکومەت و هاوڵاتیدا ئەرك وماف دەستنیشان نەکراوە، بڕیاری چارەنووسساز تەنها تەنها لەژێر خێمە سەرك هۆزەوە دەدرێت، ئەو فاکتەرانە هاوڵاتی تووشی سستی بیرکردنەوە لەمەسەلە چارەنووسسازەکان کردووە، تووشی خەمساردی کردووە لەئەرکە مۆراڵییەکانی و پاڵی بەخەیاڵی ئەو دەسەڵاتدارەوە داوەتەوە کە لەبری ئەویش بڕیاردەدات و بەرپرسییەکان ئەگەر پێ بزانێت لەئەستۆ دەگرێت، ئەوەش پەرچەکردارێکی ئاساییە، کە هاوڵاتی لەدەرەوەی پرسە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان بووە لەدەرەوەی بەرپرسیارەتیش دەبێت، ئەوەی ئەو پرسانەی تەنها لەبۆتەی ئایدۆلۆژی خۆیدا تواندووەتەوەو رووبەرێکی دی بۆ پرسە مرۆییەکان نەهێشتووەتەوە. ئەگەر توانیمان ئەو گۆڕانکاری لەمۆراڵی مامەڵەو مۆراڵی نیشتیمانیماندا بکەین بەراورد بەو دەستەوسانی و چەق بەستنەی لەقسەی نەرێتی و یادکردنەوەی کاڵ و میللی بۆ کارەساتی زیندوو چی لەهەناودا هەڵنەگرتووە بۆ بەشێکی گرنگی یادەوەری و بیروباوەڕو



ئەخلاقی هەموو تاکێك، ئەو مۆراڵە لەچەند تەوەرێکدا خۆی دەبینێتەوە، لەوانە

**1–** چەمکی ئەنفال لەڕەهەندی بەزییەوە بگوێزرێتەوە بۆ رەهەندی رێز: مەبەستم لەڕەهەندی بەزەیی ئەو میکانیزمە سۆزدارییەیە کە رۆژانە رۆحی پاشماوەکانی ئەنفالی پێ ملّەما دەکرێت، بەسێبەری وشە قورس و نەرێتییەکان دەیانهەژێنن و ئەوانیش جارێکی دی بەشێوەی جیاواز لەناخی خۆیاندا بەرهەمی دەهێننەوە. ئەو بەرهەمهێنانەوەی ئەوان هەمیشە خۆیان بەقوربانیی بزانن و حکایەتی بەزەیی هێنەر بن نەك شانازیی هێنەر، داستانی درۆزەکردنی سۆز بن نەك دەستەبەرکردنی ماف، نموونەی مرۆڤی ساویلکەو نەزانی لادێ بن و نەویتر لەچەمکەکانی شاریی و شاریبوون، نەك مرۆڤی شۆڕشگێڕو پارێزەری شار. ئەو سێ چەمکە، بەزەیی و سۆزو لادێی بوون لەنەستی مرۆی رزگاربوو لەئەنفال و کارەساتی ئەنفالدا کراون بەتایتڵی سەرجەم کارەساتەکەو لەیادکردنەوەوە هەتا ناساندنی وەکو کارەساتێکی مێژوویی و ستراتیژی سیاسی و مرۆیی، هەمووی تائێستا خۆی لەو سێ خاڵەدا بینیوەتەوە، ئەوەش کارەساتی گەورەتری لەبەردەم زیندووهێشتنەوەی ئەنفال دروستکردووە.

**2–** ئەنفال بکرێت بەئەرکێکی ئەخلاقیێکی سەپێندراو نەك داواکراو:

ناکرێت چاوەڕوانی ئەوە بکەین یان داوا لەخەڵك بکەین ئەرکی ئەخلاقی بەرامبەر ئەنفال تێدابێت، ئەوەشی بۆ بکەین بەمێژوویەکی پرشنگدار، بەڵکو دەبێت بکرێت بەئەخلاقی هەموو تاکێك و بەسەریدا بسەپێت وەکو مەرجی ژیان و مرۆڤ بوون، ئەویش لەچەندین رێگەوە هەندێکیان خۆی لەڕێگەی بەمێژوو سەپاندنەوە دەبینێتەوە، وەکو ئەوەی بکرێت بەسەبجێکتی خوێندن لەهەموو قۆناخەکانی خوێندندا لەسەرەتاییەوە هەتا زانکۆ و بەپێی قۆناغ و تەمەنەکان گرێبەندی بکرێت، ببێت بەشێك لەژیانی زانستی. وەکو شوناسیش بکرێت بەتاقیکردنەوە بەنووسین و بەزمان بۆ ئەو کەسانەی کورد نین و دەیانەوێت لەماوەی 2 ساڵ زیاتر لەکوردستاندا بژین، بوکلێتێکی تایبەت دەربارەی ئەنفال دروستبکرێت و هەر کەسێکی بێگانە یان تەنانەت ئەو منداڵە کوردانەی لەڕۆژئاوا لەدایکبوون دەیانەوێت بێنەوە کوردستان بژین ئەو بابەتەیان بدرێتێ و ماوەیەکی دیاریکراویان بۆ دابنرێت تاقیکردنەوەی بەنووسین و بەقسەکردن تێدا بکەن، واتە ئەنفال بکرێت بەتاقیکردنەوەی کوردبوون و لەووڵاتی کورددا مانەوە بۆ کورد بۆ بێگانە، ئەگەر دەرچوون ئەوجا مافی مانەوەیان لەکوردسانندا هەبێت. لەڕێگەی کەناڵەکانی راگەیاندنەووە بایەخی تەواوی پێبدرێت و نەخرێت نێو یەك رۆژی رۆژمێری یادەوەرییەوە ساڵانەوەو هیچی دی، بەڵکو یان کەناڵێکی تایبەت بەو مەسەلەیە بکرێتەوە، یاخود هەر یەك لەتەلەفزیۆنەکان هەفتەی رۆژێك بۆ ئەو



مەبەستە تەرخان بکەن، گرنگ نییە ئەگەر یەك بەرنامەش بێت و هەفتەی رۆژێك لەتەلەفزیۆنەکانەوە نمایش بکرێتەوە، زۆر گرنگە خەڵك ناچار بکەییت گوێ لەئەنفال بگرێت، لیی بڕوانێت، ئەگەر خۆشی نەیخواست بکرێت بەبەشێك لەکاتی و ناچار بکرێت ئەنفال بەشێك لەکاتی بگرێت، لەوانەیە بڵێت ئەوە سیستمێکی دیموکراتی نییە، بەڵام ئەگەر سەیری سیستمی جیهانیش بکەیت خاوەنی ئەنفالیش نین، تەنها خاوەنی دانی مافی پەنابەرین بۆ بەستنەوەی هەستی پەنابەر بەووڵاتەکانیەوە وەکو هەستی هاوڵاتی ئەسڵی بەشێوەیەك لەشێوەکان پابەندی ئەو جۆرە پرۆگرامەن.

کردنەوەی دەیان ماڵپەڕو گرووپ و تۆڕی ئینتەرنێتی بەو مەبەستە، من لەوە سەغڵەت نابم ئەگەر سەدان رێکخراو بەناوی ئەنفال بکرێتەوە، گەرچی هەندێکیان تەنها بۆ پارە پەیداکردن و هەشە بۆ هەڵوێست تۆمارکردن، هەشە بۆ ناو دەرکردن لەو بوارە نزیك بووەتەوە، بەڵام زۆر گرنگە لەوە سەغڵەت نەبین کە ژمارەی رێکخراوەکان نەك هەر زۆربن، بەڵکو هەموو تاکەکانی کورد لەچواچێوەی رێکخراوە جیاوازەکانی ئەنفال جێگە بکرێتەوەو وابکرێت هەموو کورد سەرقاڵ، بەشدارو کارابێت لەچەمکێکی ئەنفالدا.

**3–** گۆڕینی کلێشەی ئەنفال لەقسەی سەر زارەکییەوە بۆ فیلمی دۆکۆمێنتاری:

ئەوەی تائێستا دەربارەی ئەنفال دەگوترێت، زیاتر قسەی سۆزداین، نەک لێکۆڵینەوەی ئەکادیمی، زیاتر سۆز وروژاندنە، نەک پیشاندانێکی واقعی کە لەهەموو وشەیەک زیاتر کاریگەری دەبێت، بەتایبەت لەسەر دەرەوەی کوردستان هەروەها دەبێت بە بەڵگەی مێژوویی و سەرچاوەی مێژوویی بۆ داهاتوو.

**4–** گۆڕینی لەحکایەتەوە بۆ کارەسات:

خەریکە ئەنفال لەهزری خەڵکدا دەبێت بەحکایەتێکی سواو، حکایەتێکی تراژیدی، کە نایەوێت دووبارە گوێی لێبگرێت بۆ ئەوەی هەموو ئازارەکانی خۆی بیر نەهێنێتەوەو حکایەتێک تەنها حکایەتخوان گوێگرو بێژەرە، ئەمەش تەنها لەبێ دەربەستی خەڵکەوە فەراهەم نەهاتووە، لەنەمانی متمانە بەدەسەڵات و بەڕێوەبردن لەناوچەکەداو متمانە بەخشینی ئەوان بەئەنفالچییەکان و نەبوونی خوێندنەوەی دروست بۆ ئەو کارەساتە بەئاستێک کاریگەری لەلای بەرامبەر جێبهێڵێت. جگە لەنەفرەت لەخوود کردن، ئەو کاتەی مرۆڤ لەخۆی دەپرسێت قوربانیم بۆ کێ دا، کێ بردییەوە و کێ دۆڕانی، کۆدەکانی نیشتمان و شۆڕش دەکەونە بازنەی گوومانەوە، گوومان نەفرەت بەرهەمدەهێنێت، نەفرەتیش رووداوی لۆژیک دەکات بەخەیاڵی و حکایەت.



**5–** هێڵکێشانێکی هونەرییانەی سیاسی بۆ یەکگرتنی ئەرکە ئەخلاقییەکانی کورد:

ئەنفال هەر تەنها لەکوشندەیی و هەژاریی بەڕێوەبردنی دەسەڵاتی کوردیدا گورزی کوشندەی بەر نەکەوتووە، رۆحی جوداخوازیی و ئەتک و خۆبەبەرپرسیار نەزانینیش گەورەترین گورزی بەر ئەنفال و چەمکەکانی دی کوشتن و قڕکردن و شەهید داوە، لەقسەکردن و رەفتاری تاکی کورد بڕوانە هەتا ئێستاش بەبەشەکانی کوردستان دەڵێت کوردستانی عێراق، ئێران، تورکیا و سوریا، نەک باشور، باکور، رۆهەلات و رۆژئاوای کوردستان. هەتا ئێستا هەر پارچەیەک بەجیاوازی بەرگری لەخەباتی خۆی دەکات و یەک دەنگی نەبڕاوە بەبەر کارەساتەکانمان، ژمارەیەکی زۆری بەشەکانی دی کوردستان بەباشی ئاگایان لەکارەساتی ئەنفال نییە، هەر وەکو چۆن ژمارەیەکی بەشەکەی ئێمەش ئاگایان لەکارەساتەکانی ئەوان نییە، کە باس لەکارەساتەکان دەکەن تەنها باس لەکارەساتی ئەو بەشەی خۆیان دەکەن و لەئەجندەی کاریاندا ئەنفالیان دانەرشتووە، تا ئێستا غەمێکی گشتگیر نییە بۆ لایەنی زمانەوانی و تێگەشتنمان لەیەک، هەژارترین میللەت لەڕووی فەرهەنگی و سیاسییەوە، هەژارییان ناگات بەئاستێک نەتوانن چەند خولێکی زمانەوانیان هەبێت بۆ دیالکتیکە جیاوازەکان و فێر بوون و تێگەشتن لەیەکتری، تائێستا لەو بەشەی کوردستانی ئەنفالکراویشدا مەسەلەی جیاوازی نێوان سۆرانی و کرمانجی رەواجی هەیە، بەیەک چاو سەیری ئەنفالکراوەکان و لەئەنفال رزگار

کراوەکان ناکرێت. ئەوانەش تەنها خەمساردی بەرهەم نەهێناوە، بێبەهابوونی مرۆڤ و بێبەهابوونی کوردیشی بەرهەمهێناوە، ناکرێت ئێمە خۆمان بەها بۆ خۆمان دانەنێین و داوای بەها لەبەرامبەر بکەین.

**6–** گواستنەوەی رزگاربووانی ئەنفال لەدەرەوە بۆ ناوەوەی کایە کۆمەڵایەتییەکان: کەسی لەئەنفال رزگار بوو لەنێو کۆمەڵی کورداو لەژێر سایەی بەڕێوەبردنی کوردیدا خەڵکانێکی پەراوێزخراوی کۆمەڵایەتین لەهەموو رووەکانەوە، رۆشنبیری، فەرهەنگی، خوێندەواری، هاوکاری و گوزەرانی رۆژانە، ژیانی هاوسەری و هەبوونی رەچەڵەك و کایە خزمەتگوزارییەکان و ..هتد. هەر یەك لەو خاڵانە مرۆڤی رزگاربووی ئەنفالی لەمرۆڤێکی کۆمەڵایەتییەوە گواستووەتەوە بۆ مرۆڤێکی گۆشەگیرو پەراوێز، ئەوەش خوێندنەوەی دەروونی کۆمەڵایەتی و سیاسی زۆر هەڵدەگرێت لەم دیدارەدا باسناکرێت، بەڵام دەکرێت ئاماژە بەوە بکەین، ئێمە کورد بەگشتی و دەسەڵاتدارانی کورد بەتایبەتی ئەگەر بەها بۆ رزگاربووانی ئەنفال دانەنێت، چۆن دەتوانێت بەها بۆ کارەساتەکە دابنێت و بیکات بەکارەساتێکی زیندوو، لەکاتێکدا لەبێبەهاییان لەنێو کایە کۆمەڵایەتی و ژیانییەکاندا زۆر لەئەنفال بەجێماوو تەنانەت ئامادەیی ئەوەی نەماوە لەدیدارێکدا باس لەتراژیدیای خۆی بکات، چونکە چیدی ئامادە نییە تەنها ئامرازی ئەدڤەرتایز و راگەیاندن بێت. لەبەرژەوەندی کەس و دەزگاو راگەیاندنە جیاوازەکان بەکاربهێنرێت، بێ رەچاوکردنی بەرژەوەندیی خۆی.



**7–** هەبوونی دەزگای کارا بەو کارەساتە:

دەزانین کۆمەڵێك دەزگای حکومیی و حزبیی بەناوی جۆربەجۆر و پاشگری ئەنفال کراونەتەوە، بەڵام لەڕاستیدا بەو ئامانجە کار ناکەن، یاخود دەتوانین بڵێین، لەکاتێکدا پێویستە 100٪ ئامانجی کارکردنیان ئەنفال بێت، 20٪ ئامانجیان بۆ ئەنفال تەرخان کردووەو 80٪ بۆ کاری بەرژەوەندیخوازی حزبیی و لایەنکاریی و کەسیی بەکارهێناوە ( ئەم نموونە رێکخراوی چاك ناگرێتەوە )، لەلایەکی دی ئەوەی زۆر گرنگە لەمەسەلەی ئەنفالدا کۆکردنەوەی کەسانی لێکۆڵیارەو نووسەرانی ئەو بارەیە لەژێر یەك چەتردا، ئەویش چەتری دەزگایەکی لێکۆڵینەوەی سەربەخۆیە بۆ هەموو کوردێك و دەستەبەرکردنی پێداویستییەکانی لێکۆڵیار بۆ خۆتەرخانکردن بۆ لێکۆڵینەوەو بەدواداچوون سەبارەت بەئەنفال.

**8–** یەکخستنی کارەکان لەناوەوەو دەرەوەی کوردستان: پتەوکردنی پەیوەندی ئەوانەی ناو کوردستان بەوانەی دەرەوە، لەو رێگەیەوە هەوڵدان بۆ بەجیهانیکردنی ئەنفال، ئەوەیان زیاتر بەوانەی دەرەوەی کوردستان دەکرێت، بە بەستنەوەیان لەگەڵ فاکتەرە زیندووەکانی ناو کوردستان. ناکرێت خەڵك بەبەپێی کات و تەنها بەهۆی پاڵنەری دەروونی خۆی لەئەنفال بکۆڵێتەوە، پێویستە ئەو کەسانە ژیانیان دابین بکرێت و تەرخانبکرێن بۆ ئەو مەسەلانە.

**9–** کۆکردنەوەی هەموو ئەو بەرهەمانەی لەسەر ئەنفال نووسراون: دانانیان لەسەر رەفەی تایبەت بەو مەسەلەیە لەهەموو کتێبخانەکانی جیهاندا، جا نازانم لەکتێبخانەکانی کوردستان خۆیدا تا چەند ئەوە کراوە، هەروەها دانانیان لەماڵپەڕی تایبەت بەمەسەلەی ئەنفال.

**10–** تەرخانکردنی بوودجەی تایبەت بۆ وەرگێڕان:

وەرگێڕان شوناسی هەر نەتەوەیەك دەكات لەجیهانداو دەرگایەکە بۆ جیهانی ناساندن، تەرخانکردنی بوودجەی تایبەت بۆ وەرگێڕانی سەرجەم ئەو نووسراوانەی لەسەر ئەنفال نووسراون بۆ زمانە زیندووەکانی جیهان. بەشێکە لەپرۆسەی بەزیندوو هێشتنەوەو بەجیهانیکردنی.

11– کردنەوەی مۆزەخانە لەهەموو شارە گەورەکانی کوردستان و دەرەوە:

لەپارچەکانی دی کوردستانیش، ئەوانەی مۆڵەتیان دەدەن، هەروەها جیهانی رۆژئاواش، دیارە رۆژئاوا مۆڵەتی ئەوە دەدات ئەگەر دەسەڵاتی کوردی مۆڵەت بەخۆی بدات کار بۆ ئەو مەسەلەیە بکات، یان لایەنی کەم هەوڵدان بۆ دابڕینی بەشێك گەرچی بچووکیش بێت لەمۆزەخانە نێو دەوڵەتییەکان. جوولەکەکان یەکێك لەو خاڵانەی لەمەسەلەی جینۆسایدی خۆیاندا بایەخیان پێدا مۆزەخانە بوو، لەزۆربەی وڵاتانی رۆژئاوادا مۆزەخانەی تایبەتیان بەو کارەساتەی خۆیان کردووەتەوە، ئەوە مێژووکردن و زیندوو هێشتنەوە دەگەیەنێت.



**12–** هەبوونی دەزگای ئەرشیفی تایبەت:

دروستکردنی ئەرشیف و ئەرشیفکردنی هەموو ئەو دۆکۆمێنتانەی ژێر چنگ کەوتوون لەگەڵ هەموو ئەو کارانەی بۆ ئەنفالکراون، نەشاردنەوەیان لەنووسەرو لێکۆڵیار، هەتا ئێستا تەنها هەندێك بەڵگەنامەی کەم دەستی خەڵکانی حزبی ناو دەزگاکا دەکەون و بابەتێکی بەدڵی دەزگا لەسەر دەنووسن، نەك لەئاستی کارەساتەکەدا، ئەوانەی ویستبێتیان لەئاستی کارەساتەکەدا کار بکەن دژایەتی کراون و نەیانهێشتووە کارەکانیان مەیسەر ببێت.

**13–** دارشتنەوەی ئەنفالە لەنێو بەیتە میللییەکان و شیعرە کلاسیکییەکاندا.

وەکو دەزانین رێژەیەکی ئێجگار زۆری لەئەنفال بەجێماوەکان و کوردیش بەگشتی نەخوێندەوار و بەتەمەنەکانن، لاوەکانمان زۆربەی شەهیدو ئەنفالکراون، سروشتی کوردەواریشە شەیداییەکی زۆر لەمرۆڤی کورددا بەدیدەکرێت بۆ شیعر، بەتایبەت شیعرە کلاسیکییەکان، هەر ئەو شیعرانەش هاوشانی فاکتەرەکانی دی رۆڵی گەورەیان بینیوە لەزیندووراگرتن و هەڵگیرسانی هەمیشەی شۆڕش و کوردایەتیکردن لەنێو ریزی نەخوێندەواران و بەساڵاچوانی کورد، لەگەڵ هەموو کارەسات و نەخوێندەواری و نەبوونییەکانیشدا زۆربەی بەساڵاچووانی کورد بەدەیان بەیت شیعری سەبارەت بەو دیاردەو رووداو و کارەسات و شۆڕش و رەمزە نیشتمانییەکانی کورد دەزانێت و زۆر جار دەیکات بەوەڵامی ئەو

پرسیارانەی سەبارەت بەو رووداو و دیاردانە رووبەڕووی دەبنەوە. ئەو هەڵویستەش لەجەهل و نەزانینی بەساڵاچوانەوە نەهاتووە، بەڵکو بەپێچەوانەی هۆز–مۆدێرنەکانی ئەمڕۆ، لەرێزگرتنیان بۆ خوێندەواری و خوێندەواران و بیری شۆڕشگێڕی شاعیران بووە لەو وتەو شیعرانەی کە گوزارشتکەر بووە لەسۆزو دەربڕین و بیری شۆڕشگێڕیی ئەوان. لەم روانگەیەوە دارشتنەوەی ئەنفال لەبەیتە میللیەکاندا ئەرکی هەموو دڵسۆزێکی ئەو کارەساتەیە ئەو توانایە لەخۆیاندا دەبینن، کەرەستەیەکی ساکارو دوور لەتەم و مژی سەردەم بۆ ئەو چینەی ناو ئەنفال بەرهەمبهێنێت و بۆ چینی بەساڵاچووان بەگشتی کە لەدەرەوەی هەموو بایەخێکی مرۆیین و ئەوەشی لەدەستی ئێمەدایە بەرهەمهێنانی ئەو فاکتەرەیە کە بەیەکێك لەفاکتەرە رۆحیەکانی ئەوان دەژمێردرێت.

هەموو ئەوانەی باسمان کرد، نەکردنیان دەکەوێتە سەر ترسی دەسەڵاتی کوردی لەراماڵینی پەردەی ساختەو دەرکەوتنی رووی راستەقینەی رووداوەکان، دەسەڵاتێك نەیتوانییێت بێگووناهی خۆی لەکارەساتەکاندا نیشانبدات، هەوڵنادات بۆ زیندوو هێشتنەوەی، بەڵکو هەوڵدەدات قودسیەتی کارەساتەکە بەشێوەیەك بشوێنێت کە جەللادو قوربانی، ئەنفالکراو و ئەنفالچی، شۆڕشگێڕو جاش، ئەتککراو و ئەتککار، دڵسۆزو گەندەڵ یەك واتاو یەك بەهایان هەبێت، ئێمە پێویستە زۆر دڵنیابین لەوەی ئەگەر ئەو دەسەڵاتە لەگووناهی ئەنفالدا تێوە نەگلابێت، کردنی ئەو فاکتەرانەی باسمان کردوون زۆر ئاسانن و کوردیش ئەوەندەی خەڵکی بەتواناو دڵسۆزی تێدایە ئەو ئەرکەی پێ بسپێردرێت، بەڵام



هەوڵدان بۆ شێواندنی توانای ئەوانەش خۆ بەختانەو سەربەخۆیانە کار لەسەر ئەو کارەساتە دەکەن، رووخاندنی سەرخان و ژێر خانی پیرۆزییەکانی کوردەو نیشانەی پرسیار دەباتە بەردەم زۆر فاکتەرو پنت.

**پرسیار:** ئایا ئەدەبی کوردی بەتەعریفە جیاوازەکانی ئێوەوە بۆ ئەدەب چەند بەرپرسیارە لەبەردەم بیرنەکردنەوە لەئەنفال؟

**کازیوە ساڵەح:** ئەم پرسیارە رووبەڕووی کۆمەڵێك ئیشکالیەت و هێمای دیمان دەکاتەوە، لەوانە واقعی ئەدەبی کوردی لەڕابردوو ئێستادا، گوومانی هەبوونی رۆشنبیری راستەقینە، مەبەستم رۆشنبیری داهێنەرو نەحەپەساو بەئەدەبی بێگانە.

با سەرەتا ئەوە بلێین کە ئەدەب بەرپرسیارییەتی زۆر گەورەی نەکەوتووەتە سەر شان لەمەسەلەی بیرکردنەوە لەئەنفال، ئەدەب کە رۆمان و چیرۆك و شیعر دەکات، زۆر جار مرۆڤ دەخەنەوە بەر رێژنەی سۆزو لاواندنەوە، لەوێشەوە حیکایەتخوانی، پێویستمان بەوەیە ئەنفال لەحکایەت و سەرگوزشتەی سۆزدارییانە دەربێنین بۆ جیهانی لۆژیك و مێژوو، مێژوو وەکو کرۆنۆلۆژیاو وەکو فێکشنیش، ئێمەش ئەدەبی مێژوویمان ئەگەر هەشبێت مردوو و لاوازە، خاوەنی ئەدەبی مێژووی نین، سەرباری ئەوەی ئەمڕۆ ئەدەبی بەرگری لەجیهاندا رەواجی نەماوە، تەنانەت ئەگەر جارێکی دی مەکسیم گۆرکی چیرۆکێکی دی وەکو دایك، یان دایکی لەڕۆژگاری ئەمڕۆدا بنووسیبایە ئەو کاریگەرییەی نەدەبوو کە

کاتی خۆی لەسەر چین و تۆیژەکانی خەڵکی داینا و رۆحی بەرگری و بەرخودانی کردە دۆستی مرۆڤ.

دیسان بیرمان نەچێت ئەدەبی کوردی سەردەمە مێژووییەکانی خۆی سروشتیانە نەبڕیوەو ئێمە ناتوانین پۆلێنیان بکەین، چونکە هەموو سەردەمەکانمان تێکەڵکراوە، هەروەها ئاسان نییە ئەدەبی میللی، ریالستیک، بەرگری و مێژووی و فەنتازی و ...تد لێك جوودا بکەینەوە، وەکو سەردەمی تایبەتیش پۆلێنیان بکەین لەمێژووی ئەدەبی کوردیدا.

ئەدەبی رۆماننووسی گرنگترین و هەناسەدرێژترین کاراکترە بۆ گوزارشتکردن لەکارەساتە گەورەکان، بەڵام ئێمە لەو بوارەشدا زۆر لاوازین، ئەگەر ئەدەبی گێڕانەوە، واتە رۆماننووسین کۆنترین ئەدەبە لەنێو مێژووی جیهانداو پاشان لقەکانی دی ئەدەب هاتوونەتە ئاراوە، ئەوا ئەدەبی رۆمانووسی لەنێو کورردا زۆر نوێیەو تەنانەت لەپاش راپەڕین خەریکە هەندێك ئەو بوارە گەشە دەکات و خەڵکانێك توانای خۆیان لەو بوارەدا تاقی دەکەنەوە، ئەمە جگە لەوەی رۆماننووسین کات تەرخانکردن و بیر تەرخانکردنێکی باشی دەوێت، رۆماننووسەکانی رۆژئاوا ساڵی رۆمانێك دەنووسن و ئەو ساڵە بەداهاتی ئەو رۆمانە دەژین و کاتەکەیان تەرخاندەکەن بۆ رۆمانێکی دی، بەچەندین شتی جیاوازو لاوەکییەوە سەرقاڵ نابن کە تووشی گرفتی دابڕان و بیر ئاڵۆزیی بکات، بەڵام نووسەری کورد نە خۆی بەهادارەو نە بەرهەمەکەی، دەتوانم بڵێم نووسەری کورد لەمرۆڤایەتی و مرۆڤبوونی خۆیەوەیە دەنووسێت، دەنا ناکرێت نووسەرێك تەنانەت بۆ کورتە چیرۆکێکیش ئەوەندە درەنگ



بتوانێت بچێتەوە سەری زنجیرەی بیری تێك چووبێت و نەزانێت بەچ ئامانجێك سەرەتای دامەزراندووە. ئێمە تەنها دەتوانین گلەیی لەنووسەر بکەین، بەبێئەوەی لەبارودۆخی خودی نووسەرو بارودۆخی چاپکردن و خوێنەر بپرسین. لەمانەش هەمووی گرنگتر کاریگەری دەسەڵات و سیاسەتی کوردیە لەسەر داڕشتنەوەی کەسیەتی تاکی کورد بەنووسەرانیشەوە، بەئاشکرا ئەوانەی بەشێوەی راستەقینە کار بۆ ئەنفال دەکەن، دژایەتی دەکرێن و پەردەیەکی ئایدۆلۆژی و بەرژەوەندخوازانە بەسەرمەسەلەی ئەنفالدا دادراوەتەوە، هەڵدانەوەشی ئاشکراکردنی دەستی نهێنی دی، بۆیە نووسەرە دەزگایەکان و نووسەری ئایدۆلۆژی پەرەست نایەوێت بایەخ بەئەنفال بدات و بەرژەوەندی خۆی لەپێناوی بەرژەوەندی گشتیدا بخاتە مەترسییەوە. جگە لەوەی خودی تاکی کورد بەهەموو چین و توێژەکانییەوە.

لەلایەکی دی سەرسامی نووسەری کورد بەئەدەبی عەرەبی و فارسی دەتوانین بکەین بەخاڵێکی دی، لەو خاڵانەی هەمیشە پەنای بۆ بابەتێك بردووە لەڕوانگەی ئەو دوو ئەدەبەوە، ئەوانیش خۆیان کارەساتەکەیان بەسەر کورد هێناوەو بۆیە نەهاتوون گوزارشتی لێ بکەن و خۆشیان خاوەنی ئەو جۆرە کارەساتە نین، هەتا خاوەنی چامە ئەدەبی بن و کوردیش وەکو هەمیشە بکەوێتە ژێر کاریگەرییان و گوزارشتی ئەدەبیانە مێژووی کارەساتەکانی بنووسێتەوە، خۆ ئەگەر کورد میللەتێکی ئنیگلیزییزان بوایە، ئەوا بەسەدان رۆمان و بابەتی ئەدەبی گەورەی لەسەر جەنگی یەکەم و دووەمی جیهانیی و ئاکارەکانی هیتلەرو ستالین

لەبەردەستدا بوو، دەکرا ببن بەپاڵنەرێك بۆ لەدایکبوونی ئەدەبێکی گوزارشتکار لەکارەساتە گەورەکانمان.

ئەگەری پەیوەندی نێوان رۆشنبیرو دەسەڵات، رۆشنبیرو رۆشنبیریی-ش ئەگەرێکی زۆر بەهێزی لاوازکردنی ئەنفالە لەپرۆسەی نووسیندا. لەگەڵ ئەوەی جەدەلی نێوان رۆشنبیرو دەسەڵات هەتا ئێستا یەکێك بووە لەئالیەتەکانی کارکردنی رۆشنبیر، لەگەڵ ئەوەشدا رۆشنبیری کورد نەیتوانیوە لەدەرەوەی کەسە عەوامەکان بێت و کەسیەتی نەکەوێتە ژێر کاریگەری دارشتنەوەی سیاسی و خاوەنی پرۆژەو تایبەتمەندی بێت لەدەرەوەی کاریگەری حزبە سیاسییەکان، لێرەوە جۆری پەیوەندی دەگۆرێت بەپەیوەندی نێوان رۆشنبیرو حزب، نەك رۆشنبیرو دەسەلات. رۆشنبیر هەلگری مەعریفەیەو مەعریفەش وەکو فرنسیس بیکون دەڵێت: " خۆی لەخۆیدا دەسەڵاتە "، ئەوەش لەوڵاتانی دیموکراسیدا لۆژیکە، رۆشنبیرو هونەرمەندێکی خاوەن جەماوەر لەدەسەڵاتدارێك زیاتر خەڵك دەکەوێتە ژێر کاریگەری بۆچوون و داواکانییەوەو دەسەڵاتیش وەکو هێزی بەرانبەر لێی دەروانێت، چونکە دەسەڵاتی رۆشنبیری لاوازتر نییە لەدەسەڵاتی سیاسی، هەر ئەو دەسەڵاتە رۆشنبیرییەش لەژێر کاریگەری تیۆرە کۆمەڵایەتی و سیاسی فەلسەفییەکانی زانایان و رۆشنبیرەکانیان شۆرشەکانی رۆژئاوا گەشتن بەلوتکە و گۆرانکاریی بابەتیان بەرجەستە کرد، بەڵام لای ئێمە تێکەڵاوبوونی پێناسی فێرخوازەو رۆشنبیرو نەبوونی هێڵێکی مەعریفی جیاکەرەوە، مملەکەتێك رۆشنبیری بێدەستمایەی فکری و دەرەوەی کایەی رۆشنبیری بەرهەمهێناوە، جۆرە مرۆڤێك ئەو هێڵە



سوورە نەبینێت کە وەزیفەی رۆشنبیر لەنێوان رۆشنبیرو دەسەڵات یان حزبدا دەیکێشێت، ئەویش درککردنە بەقەیرانەکانی کۆمەڵەکەی، کە درکیشی پێکرد هەستکردن بەلێپسراوێتی تا ئاستی وتەکەی سارتەر کە دەڵێت: " لەهەر کوێ ستەم هەبوو ئێمەی نووسەران لێی بەرپرسیارین "، ئەو هەست بەبەرپرسیارەێتی پێشتر باسمان لێکرد رۆشنبیر نەك هەر لەبۆتەیدا تواوەتەوە، باوەری تەواویشی بەوەیە وەکو بوونەوەرێکی سیاسی مامەڵەی لەگەڵ بکرێت و مامەڵە دەکات، رۆشنبیرێك لەدەسەڵاتداران زیاتر غەمی جەماوەر کۆکردنەوەیەتی، لەوان زیاتر چەواشەکاری بەکاردەهێنێت بۆ راکێشان و کۆکردنەوەی خەڵك، رۆشنبیرێکی دەوێت لەگەڵ دەسەڵات هاوشان و هاوگوتار بێت، لای جەماوەرەوە بەهاو تارمایی دەسەڵاتی هەبێت، لە قسەکردندا رەخنەگر نەبێت، دبلۆمات بێت و دڵی سەرجەم جەماوەر رازی بکات، وەکو ئەوەی چاوەروانی سەرکردایەتی داهاتوو بێت کە لەدەستی رۆشنبیراندا بێت نەك سیاسەتمەداران. بەهەرحاڵ بەدەگمەن رۆشنبیری ئایدیاڵمان هەیە، کە خۆی بۆ رەخنەگرتن و راڤەکردنی کێشە کۆمەڵایەتی و سیاسی و مرۆڤایەتییەکانەوە قاڵ کردبێت لەوەزیفەی خۆی دانەبرابێت. پەرتەوازەیی وەزیفەی سەرەکی رۆشنبیر راستەقینەکانیش لەنێو تێفکرین و راستکردنەوەی ئەو هەموو ناهەمووارییەی وەزیفە نوێ جیاوازەکانی جیهانی رۆشنبیری کوردی دروستیکردووە وای کردووە، ئەنفال بەختی کەمتری بەربکەوێت، ئەمرۆ هیچ هەنگاوێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری رەوتی دروستی خۆی ناگرێت کە دەرئەنجام پێویستی بەواعیزو

رەخنەگر نەبێت و تێفکرین بەلای لەدایکبوونی جیهانبینێکی نوێدا بڕوات، هەنوکە باردۆخێکی نیوە بەمەبەست دروستکراو نیوە بەناچاری وایکردووە، رۆشنبیرە ئایدیاڵەکان فریای راڤەکردنی ئەو هەموو پاسیڤە نوێیانە نەکەون، رووبەڕووی کۆمەڵەکەیان دەبێتەوەو بەرنامە رێژییەکیان لەوەزیفەی خۆیاندا پێ نەکرێت .

لە ئەگەرێکی لاوازتردا دەکرێت هەندێك لەنووسەرانیشمان هێندە کارەساتەکە کاریگەری لەسەر دانابن، ئەوەشی لەسەر ئەنفال هەیانە بڵاوینەکەنەوە، بالای بەرهەمی ئەدەبی و نووسین و خودی پێنووسیش نەوی تر ببینن لەبالای زراڤ و مەزنی ئەنفال، خۆم یەکێکم لەوانەی بەهەموو شێوەیەك و توانایەك پەلاماری ئەو مەسەلەیەم داوە لەنامە نووسین و پەیوەندیکردن بەدەسەڵاتدارانی هەر وڵاتێك تێیدا ژیابێتم بەمەبەستی بایەخدان، تێگەیاندیان لەو جینۆسایدەی بەسەر کورد هاتووە هەتا نووسین، بەشی دوو کتێب لێکۆڵینەوەو وتارم دەربارەی ئەنفال هەیە، چیرۆك و شیعرو دیداری رۆژنامەوانی ( تەنانەت دیدارە رۆژنامەوانییەکانم لەپێناوی ئەنفال تیشك خستنە سەر ئەنفال و هەڵەبجە ئەنجاممداون، نەك بەمەبەستی کاری رۆژنامەوانی ) و ساڵی پاریش نۆڤلێکم دەربارەی ئەنفال نووسیوە، لەگەڵ هاندانی هاوڕێیانیشمدا نەمتوانیوە بەچاپیان بگەیەنم و کەمیشم لێ بڵاوکردوونەتەوە، بەڵام ئەوانەشی بڵاوکراونەتەوە بەسەر خوێنەردا تێپەڕیوەو پێی نەزانیوە لەجیهانی کوردیدا بایەخی پێنەدراوە، بۆ نموونە چیرۆکی " کێ کوشتنەکەی ئاشکرا کرد " پاڵەوانی سەرەکی سەگێکە، ئەو سەگە



لەهەموو کارەکتەرەکانی ناو چیرۆکەکە بەهەستترو مرۆخوازترو دۆستخوازترە، ئەو سەگە، سەگێکی لەئەنفال بەجێماوە، بۆیە کراوە بەسەگێکی ئەفسانەیی. هەمان چیرۆك کراوە بەئینگلیزی، یەکێك لەمامۆستاکانی کلاسی یازدە ساڵی پار کردی بەبابەتی کلاسەکەی، لەشیکردنەوەی کارەکتەرەکاندا خێرا ئەوەی پرسی تۆ دەڵێیت ئەو سەگە لەلادێکان بەجێماوە، جێهێشتن، کۆچکردنی بەکۆمەڵی ئەو شوێنە دەکات، دەنا دەکرێت سەگێك لەکاروان، لەڕیگە لەسەفەردا بەجێبمێنێت، بەڵام لەلادێدا بەجێنامێنێت وندەبێت، پاشان باسی کارەساتی ئەنفالم بۆ کرد، چۆن هەموو شتێك ئەنفالکراوە، لەلادێیەکیش تەنها سەگێك بەجێماوەو ئەنفال نەکراوە، لێرەوە ناڵێم چەند سەرسام بوو، بەڵام دەڵێم هەتا ئێستا هیچ کوردێك درکی بەوە نەکردووە ئەو سەگە لەئەنفال بەجێماوە، هەندێجار بەگوومانم لەوەی لەناو کورددا خوێنەر هەبێت ئەو کارەساتە ئەوە دەگەیەنێت، کە خوێنەری کورد زیاتر خوێنەری چێژ وەرگرن نەك خوێنەری رەخەگر یان راڤەکار. دیسان واتای ئەوەیە، ئێمە خاوەنی رەخنەی ئەدەبی نین و رەخنەگری ئەدەبیمان لەپەنجەی یەك دەست تێناپەڕێت، لەوانەیە ئەگەر شتێکیش دەربارەی ئەنفال نووسرابێت نەگەشتبێت بەخوێنەر، چونکە هەتا ئێستا هیچ رەخنەگرێکی ئەدەبی نەهاتووە لێکۆڵینەوەیەك تەرخان بکات بەو بەرهەمانەی تەنها لەسەر ئەنفال نووسراون. لەو رووەوە تەنها ئەدەب لاواز نییە، هونەریش بەگشتی لاوازە، نەیتوانیوە شوناسێکی جیاوازتری لەئاستی دەربڕینی وشەی ئەدەبی پێبێت بۆ شوناسی ئەنفال.

**پرسیار:** ئایا ئاستی ئەو ترسە شاراوەیەی لای ئینسانی کورد هەیە بەرامبەر کوردبوونی خۆی، ترسێکە خاوەنی هێزیکی رۆشنبیری وایە کە بتوانێت لەبری تۆڵە، خۆی بکات بەهێزێك کە هەڵگری لێبوردن بێت، ئایا ئەم هێزە چەند دەستەڵاتی کوردی لێی بەرپرسیارەوو چەندیش کۆمەڵگەی کوردی و رۆشنبیرەکانی بەرپرسیارن لەپیشاندانی؟

**کازیوە ساڵەح:** ئەو ترسەی لای مرۆڤی کورد هەیە ترسێکی رەوایە، نارەوایەتی لەنەدۆزینەوەی گرێکوێرەکانیدا کە خودی ترس لەئایندەی کۆمەڵگا چارەسەری دەکات، کۆمەڵی دوای شەڕگەکان و کۆمەڵی پاشماوەی پاکتاوکردن، هەمیشە لەترس و گوماندا دەژی، ترس لەئایندە، ترس لەدووبارەبوونەوەی رابردوو و گومان لەدڵسۆزی بەرامبەر، گومان لەئینتیما، گومان لەداهاتوویەکی بەختەوەر، چونکە پاکتاوکردن پرۆژەی دەرەوەی ویژدان و دژە ویژدانە، بۆیە گرنگترین ئامراز بۆ ئاسوودەی ئەو کۆمەڵە متمانەبوونە بەویژدانی بەرامبەر، بەرامبەری کوردیش بەهەر چواردەوردا دوژمنەکانییەتی کە تەنها مایەی ترسن، لەناوەوەش دەسەڵاتدارەکانییەتی کە مایەی گوومانن.

کۆمەڵی پاشماوەی جینووساید ترسی مامەڵەکردنی بازرگانی پێوەکردنیش دەبێت بەترسێکی ناوخۆییانەی دی، بۆ رەواندنەوەی ئەو ترسانە جگە لەدابینکردنی هەموو ئەو خاڵانەی لەپرسیاری سێیەمدا ریزمان کرد، کە جۆرێك لەمتمانە دەگەڕێنێتەوە، پێویستیمان بەپرۆژەی خۆشەویستی هەیە بۆ رەوینەوەی ئەو ترسە، کورد یەکێکە لەو کۆمەڵانەی



ناحەزانی توانی زۆر بەئاسانی بیکات بەدژە خۆی و دژە خوود، مێژووی رابردوو لەهەبوونی ژمارەی ئەو هەموو جاش و خۆفرۆش و بەدەستەوەدان و دەنگ لێدانە ئەو راستییەمان بۆ دەسەلمێنێت، متمانە نەبوونی تاکی کورد بەخود لەو فاکتەرانەوە سەرچاوەی گرت، هیچ پێکهاتەیەکی فکری دروستیش لەئارادا نەبووە بۆ هێورکردنەوەی ئەو ترسە، پێچەوانەش ئەو ترسە پاش راپەڕین پەرەی سەند بۆ فۆبیا، واتە دەرەوەی ترسێکی ئاسایی، شەڕە یەك لەدوای یەکەکانی هێزە سیاسیەکانی کورد رێژەی ترسیان بەرزکردەوە تا ئاستی رقئەستووریی تۆڵەکردنەوە، تۆڵەکردنەوە لەخود هەتا تۆڵەکردنەوە لەبەرامبەر، ئەو هەستە ئەمڕۆ گەیشتووە بەلووتکە زۆر ئاساییە کەسێك ئەوی دی بکوژێت، یان خۆی بکوژێت، ئەمە بەشێکی دەرئەنجامی ئەو نەزانییە بوو دەسەڵاتداران بەکاریانهێنا لەبەڕێوەبردنی کۆمەڵی کوردیدا، ئەوانەی دوێنی نەدەترسان و خاوەنی ئەو هێزە رۆشنبرییە بوون کە باسی دەکەیت، ئەمڕۆ لەکۆمەڵی رکەبەرو تۆڵەخوازو مەرگدۆست دەترسێت، مەرگدۆستی رووی لەهەر کۆمەڵێك کرد رووبەڕووی کارەساتی گەورەو مەترسیداری دەکاتەوە، ترسی ئەمڕۆی بەشێکی کودرستان ترس نییە لەکورد بوون، ترسە لەعەقڵ و دەروونی مەرگخوازیی کورد، بەهەموو چەمك واتاکانییەوە، نەك تەنها مەرگی جەستەیی، پێموایە بەهۆی جیاوازی هەندێك بارودۆخی زمانەوانی و خوێندنەوەو هەندێك بارودۆخی دی سیاسی کوردی باشووری کوردستان کەم ترستر بوون لەکوردبوونی خۆیان و شەرمۆکانە گوزارشتیان لێ نەکردووە، هەر ئەوەش وایکردووە قوربانی گەورەش بدات و جینۆساید

بکرێت، بەڵام خەباتگێڕانی کۆمەڵایەتی و سیاسی بەشەکانی دی کوردستان ئەرکێکی قورستر لەمەسەلەی ئەو ترس رەوێنەوەدا چاوەڕوانیان دەکات، بەتایبەت ئەو ترسە گەشتووە بەئاستی خۆ بەکەمزانی، ژمارەیەکی بەرچاویان " هونەرمەندو نووسەرو هاووڵاتی" تەنانەت لەوڵاتانی دەرەوەش نەك لەناوخۆدا، ئەوەندەی خۆیان بەئێرانی، تورکی و سووری دەناسێنن ئەوەندە بەکوردو کوردستانی خۆیان ناناسێنن، ئەوەندە خۆیان خزاندووەتە دەزگا ئێرانی و تورکی و عەرەبییەکانەوە بۆ کارکردن و چالاکی ئەوەندە ئاگای لەڕەوەندەکەی خۆی نییە، ئەمەش لەدوا ڕۆژدا کارەساتی گەورەتری لێدەکەوێتەوە. دیارە هەموو بەشەکانی کوردستان کارەسات و چەوساندنەوەکانیان زۆر نزیك و چوون یەك بووە، بەڵام ئەو جۆرە جینۆسایدەی باشوور لەمێژووی جیهاندا کەموێنەیە، کارەساتیش ئەوەیە بەشەکانی دی خۆیان لەدەرەوەی ئەو چوارچێوەیە ببینن و نەیکەن بەشوناسی خۆیان، چونکە واتای ئەوەیە ئەو کارکردنەی دوژمنانمان لەسەر سایکۆلۆژیەتی تاکی کورد کردویەتی بەتەواوی جێگیربووەو کاری خۆی کردووە.

دەمێنێتەوە سەر چەمکی ڕۆشنبیریی و تۆڵەکردنەوە کە لەم تەوەرەدا وروژاندووتە، چەمکی ڕۆشنبیریی چەمکێکی زۆر لەوە بەرفراوانترو باڵاترە لەوەی لەکۆمەڵێکی کشتووکاڵیدا کە زۆرینە نەخوێندەوارن بیکەن بەشوناس کام شوناسیش، ئەو شوناسەی چارەسەری گرفتە سایکۆلۆژییەکانی پێ بکەن، زۆر جار سەرم سووڕدەمێنێت خەڵکانێك بەخۆیان دەڵێن ڕۆشنبیر، لەناو کایە کۆمەڵایەتییەکانی کورردا چەمکی



ڕۆشنبیر، بیریارو فێرکار یان فێرخواز تێکەڵاوکراوە، زۆر بەئاسانی کەسێکی لەزانکۆ دەرچوو بەخۆی دەڵێت ڕۆشنبیر، کە پێویستە بڵێت فێرخواز، یان یەکێکی خوێندەوار دەڵێت من نووسەر نیم بەڵام ڕۆشنبیرم، لەناو کوردا چونکە خوێندەواریی زۆر لاوازە، خوێندەواریان بەڕۆشنبیر ناوزەد کردووەوە تائێستاش هەر وایە، ڕۆشنبیر ئەو کەسەیە کە توانای مەعریفی و فکری لەئاستیکدایە دەتوانێت خوێندنەوەی جیاوازی بۆ پنتە جیاوازەکانی ژیان هەبێت و دەتوانێت کاریگەری لەسەر کایە کۆمەڵایەتییەکان دابنێت، واتە ڕۆشنبیریی ئایدیاڵ، لەکاتێکدا ژمارەیەکی باشی نووسەران لەپەراوێزی ڕۆشنبیریدان، لەناو ڕۆشنبیرانیشدا ڕۆشنبیریی بەرهەمهێنەرو ڕۆشنبیری ئیستهلاکی هەیە، کۆمەڵی ئێمە زیاتر خاوەنی چەمکی دووەمە، ئەگەر خاوەنی ئەو ڕۆشنبیرییە بەرهەمهێنەرە بوایە ترسەکەی نەدەگەشت بەڕادەی مەرگدۆستی و نکوولێکردن لەشوناس. ئێمە خاوەنی دیوەخانی خێڵەکیانەین لەبری سالۆنی ڕۆشنبیری و ئەدەبی، خۆ ناکرێت ئەو سەرلێشێوانەی لەماڵپەڕو بڵاوکراوەکان و زۆری ژمارەی بەناو وتارەکاندا دەیبینین بەحاڵەتی ڕۆشنبیریی ناوزەد بکەین.

دیارە ئەگەر چەمکی ڕۆشنبیری چەمکێکی کارا بوایە لەناو کۆمەڵی کوردا، چەمکی تۆڵەکردنەوە لاواز دەبوو، ئەو رقئەستوورییە لەبێدەسەڵاتییەوە فەراهەم هاتووە، ئەو بێدەسەڵاتییەی بەهۆی لاوازی ڕۆشنبیرییەوە سەرجەم تایبەتمەندییەکان و چارەنووس و بەرژەوەندییەکانی پێشکەش بەدەسەڵاتێك کردووە کە لەو ترسەی ئەو

ناکۆڵێتەوە، ئەو ترسەی وایکرد ئەوی هاولاتی دەنگی بۆ بدات، خۆی بۆ بەخت بکات و بیگەیەنێت بەپۆستەکان، ئەو ترسە بێئەنجام دەرچوو، ئەمڕۆ گۆڕا بەرك و تۆڵەو نەفرەت، بەڵام بەرامبەر بەکێ؟ ئەمڕۆ تۆڵە لەڕۆشنبیری ئایدیاڵ دەکرێتەوە کە خۆی نەخزانووەتە ناو گێژاوی میللیگەرایی و زەپۆشی عەریزە نووسینەوە، ناڕۆشنبیرو، سیستمی خێڵەکی تۆڵە لەبێدەسەڵاتەکان دەکاتەوە، نەك لەدەسەڵاتدارەکان، ئەمڕۆ تۆڵە لەوانە دەکرێتەوە کە پێیانوایە ڕێزگرتنی جاش و ئەنفالچییەکان ئەنفالکردنێکی دی دەژمێردرێت.

ئەگەر باسیش لەتۆڵەکردنەوەی ئەنفال بکەین، باوەڕم بەتۆڵەکردنەوەی کوشتن نییە، بەڵام باوەڕم بەبەخشین و دەسەڵاتداریەتیشیان نییە، بەپێچەوانەوە، پێویستە بژین، بەڵام ئەو جۆرە ژیان و بێبەهاییەی کە خۆیان مەرگ بەئاوات بخوازن، کە لای هەموو هاوولاتییەکی بچەسپێت چەمکی خیانەت و وڵات فرۆشی چ واتایەکی قێزەونی هەیەو کەسانی وڵاتفرۆش چەند خەڵکێکی دەرەوەی بەهاو دەرەوەی مێژووی مرۆڤ بوون. لەکەنەدادا سزای لەسێدارەدان نییە، زیندانی تا هەتایی هەیە، یاخوود زیندانی درێژ خایەن بەپێی تاوانەکە، لەزیندانیشدا ئەشکەنجەو لێدان نییە، بەڵام ئەوانەی پێشێلی یاساییان کردووەو زیندان کراون گەرچی تاوانەکەشیان نەگات بەتاوانی کوشتن و سیخوڕی بەجۆرێك سزای دەروونی نەك فیزیکی دەدرێن کە مەرگ بەئاواتبخوازن و هەندێجاریش خۆیان داوای بەمەرگ سپاردنیان بکەن، ساکارترین سزا بوونەوەرییەك هەیە کە بۆنێکی ئێجگار ناخۆش



بڵاودەکاتەوە، بەڕادەیەك مرۆڤ بەرگەی پێنج چرکەی ئەو بۆنە ناگرێت، سزای هەندێك لەزیندانییەکان بردنی ئەو گیانەوەرەیە بۆ ناو ژووری زیندانییەکە، ئەگەر چرکەیەك بمێنێتەوە هەفتەیەك بۆنەکەی بنبڕ نابێت، ئەمە کووشتنی راستەقیەنەیە، من پێمخۆشبوو سەدامیش لەسێدارە نەدرێت، هەتا رزین رۆژانە لەڕووی سایکۆلۆژییەوە بکوژرایە، ئەمە لەڕووی رەکەبەرێتییەوە دەنابڕم، لەڕووی زانستی و کۆمەڵایەتییەوە باوەڕم پێیەتی، مرۆڤی مەرگدۆست سەرکردەبێت یان هاووڵاتی لەمەرگی بەپەلە ناترسێت، لەمەرگی هێواش دەترسێت، لەمەرگی سرووشتی دەترسێت، لای ئەو بکوژ بێت یان کوژراو مێژووە، پاڵەوانێتییە، گووناهە تاوانبار بکرێت بەپاڵەوان. لەڕووی کۆمەڵایەتیشەوە، ئەگەر ئەو جۆرە سزا سایکۆلۆژییانە نەبرێنە ناو زیندانەوە چاکسازیی کۆمەڵایەتی بۆ تاوانە بچووکەکان بەرجەستە نابێت. دیسان بیرمان نەچێت بەخشینی تاوانبارانی ئەنفال، جاشەکان و وڵات فرۆشەکان، چەمکی خیانەت و شۆڕش و جاش و شەهیدی هاوتا کردووە، ئەوەش کۆمەڵێك بێدەربەستی و تاوانی نوێ هێناوەو دەهێنێتە ئاراوە، بەخشین کاتێك گوونجاوە تیورییەکی مۆراڵی سیاسی جیاواز لەوەی باوە پراکتیك بکرێت، ئەو کاتەی کایە سیاسی و رۆشنبیریەکان لەبەرەژەوەندی هاولاتی دەتوانن شۆڕشێکی رەوشتی بەرپابکەن بۆ گۆڕینی ئاستی رۆشنبیریی و ژیانی هاووڵاتی، گرێبەندی کۆمەڵایەتی نوێبکاتەوەو لەوێشەوە چەمکی بەخشین دەتوانرێت باڵا بکرێت، بەڵام لەئێستا هیچ گۆڕانکارییەك و تەنانەت هەوڵی گۆڕانکاریش لەکایە کۆمەڵایەتییەکاندا نەکراوە، ژیانی هاووڵاتیان و خەباتی

پێشمەرگەو شەهید شوناسێکی جیاوازی بۆ نەدۆزراوەتەوە، هەتا، سیاسەتێك هەبێت ئەوەندە جەسوور بێت بتوانێت فرۆشیارەکان ببەخشێت، نەك هەر بەخشین بالآتریشیان بکات لەئاستی ئەنفال و شەهید، ئەمرۆ ئاستی رۆشنبیریی و ئاستی یاخیبوونی هاوولآتیش بەرامبەر دەسەلآت لەو پەڕی لاوازیدایە، هاوولآتیان زیاتر هاوولآتی دەزگایین، هاوولآتی مووچەخۆری منەتبارن، بەلآم ئەمە لەگەلێ کاتتدا دەگۆڕێت، دوور نییەو رۆژێك هاوولآتیانی کورد وەکو هاوولآتیانی فەرەنسی چۆن پاش مردنی بەخیانەتی میرابۆیان زانی، هێشتا لێیٚ خۆش نەبوون و لەگۆڕستانی ناوداران و نیشتیمانپەروەرانەوە تەرمەکەیان گواستەوە بۆ گۆڕستانی پیاوخراپان، دەکرێت ئەمە چارەنووسی هەموو خیانەتکارانی ناو کۆمەڵی کوردیش بێت.



## ئەنوەری رەشی عەوڵا

(. **جاشێتی و براکوژیش لەقووڵاییدا، یەکێکن لەو رەمزو فیگەرە پاڵنەرانەی کارێکی وەهای کرد لەبوونی ئینسانیانەی خۆمان هەڵبێێن و بێهێزبوونی دەنگی ئێمە.. و دەستەوەستانیمان لەبەرامبەر بەهێزبوونی دەنگ و پلان و دوورنماکانی ئەوان بخاتەڕوو، کە بەداوەشاندنی ئێمە شکاوەیەوەو خۆمان لەهەموو بەهایەکی بەرزی مرۆڤانە داماڵی و نکوڵیمان لەگەوهەرەکەی ئەو دروشمانە کرد خۆمان پێ ئاراییشت کردبوو. هێرشی جاشەکان لەئەنفال.. و ئەتککردنی یەکتر لەشەڕە ناوخۆییەکانی شاخ و شاردا باشترین بەڵگەی ئەو تراژیدیا ئەخلاقی و سیاسییەی ئێمەن، کە هێشتاکە بەپەرۆش نین ئەو رەگە ریشەداکوتراوەی کە لەبوارە جیاجیاکاندا ماوە دەربکێشین، پێشمانوایە ململانێی فیکری ئەمە لەئێمە دەخوازێت.. نەك دەستبەسەراگرتن** ).

ئەنوەری رەشی عەوڵا



**پرسیار:** ئەگەر بهاتایە ئەنفال لەوڵاتێکی ئیسلامیدا روویندایەو هەروەها مانایەکی ئیسلامیشی پێنەدرایە، پێتانوایە ئەنفال بتوانرایە نوقمی بێدەنگییەکی وابکرێت، هەم لەلایەن وڵاتانی دراوسێوە تا دەگاتە هەموو وڵاتە ئیسلامییەکانی دونیا، ئەوسا وڵاتانی ئەوروپی؟

**ئەنوەری رەشی عەوڵا :** جۆرێك لەبێدەنگیی هەیە، ئەو ساتەوەختە دەستپێدەکات کە گەمارۆی بکەرو ئەوەی شاهیدە دەدات، هەتاوەکو ئامادە نەبێت، کارەسات و رووداوەکە وەکو خۆی بگێڕێتەوە. واتە لەو بابەتە بڕوانێت و لەکاتی دانپیانانەکەیدا ( خەسڵەتە چەسپاو و نەگۆڕەکانی) ئەو بابەتە دەقاو دەق بخاتەڕوو.

بەبارێکی تریشدا بۆ ئەوەی مانا شاراوەکانی رووداوێك بخرێنە روو دەشێ سەرنج و راڤەو ماناگەلێکی تری پێببەخشرێت، جا لۆگۆسیانە بێت ( راڤەی لۆجیکانەو ئەقڵیانە) یان میتۆسیانە ( راڤەی خواوەندانەو شاعیرانە). ئاخۆ ئێمە دەکەوینە کام بەشی ئەم بێدەنگکردنانەوە؟ بێدەنگیی ئەقلانی.. ئەخلاقی.. ئیستاتیکیانە...تاد.

کورد وەك نەتەوەیەك نقومی سێگۆشەی بەرمۆدای کەلتوورەکانی فارس و عەرەب و تورك بووە، بەهەرسێ پنتی نائەقڵانی و نائەخلاقی و نائیستاتیکیانەوە ! پێدەچێ ئەمە یەکەمین پێگەو سنووری دەستپێکردنی بێدەنگییە فەرزکراوەکان بێت.. بێدەنگییە ناقۆڵاکان!

تۆ سەرنجبدە لەکرۆکی ئایینی ئیسلام، لەیەکەمین سروش کە دابەزیووەو نێردراوە بۆ پەیامبەر(د.خ) پێیڕاگەێنراوە: ( بخوێنێتەوە)،

ئەویش فەرموویەتی: ( نازانم ). دووبارە بەگوییدا دراوەتەوە (بخوێنە بەناوی ئەو خودایەی.....)، لێرەوە– دەنگێك – هەیە کە دەنگێکی پیرۆزی بێ مەرزە.. ئەو بێ مەرزی و بێپایانییەش دەتوانرێ نیشانە گەلێك بن بۆ– هێزو دەسەڵات –. ئەم دەسەڵات و هێزەش دەسپێردرێت بەدەستی کەسێك کە لەلایەن خاوەن دەنگی یەکەمەوە شایەنی ئەو– ڕۆڵ و ئەرك – بینینەیە، کە ئەویش پەیامبەری ئیسلامە. کەوابێ لەبەرامبەر– بێدەنگییەك – کە هی پەیامبەرە، ئەمر پێکردنێك، بەگوێگرتن و خوێندنەوە ئامادەیی هەیە – واتە – تۆ کارت بیستن و جێبەجێکردنە – و ئیرادەی خودای لەسەرە، کە لەسەروو ئیرادەی ئینسانیانەی خۆتەوەیە !

ئیدی ئەم هەرەمی دەسەڵاتەش لەوێوە لێژ دەبێتەوەو دێتە خوارەوە بۆ ئەوانەی بەدوایدا دێن، ئەمەش ئەو ڕاستییەمان پێدەڵێت: ئەوەی نزیکترین پشت بێت لەپەیامبەرەوە.. پیرۆزترە.

بەو مانایەی لەبازنەی یەکەمدا کێ ئامادەیی هەبووبێت و زووتر گوێی بەپەیامەکان ئاودرابێت و بیستەری دەنگی یەکەم بێت. لەبازنەی دووەمدا کە بڵاوکەرەوەو گەیەنەرە سەرپشککراوەو زیاتر دەتوانێ دەنگ هەڵبڕتر بێت، چونکە هەڵگری (ریسالیەتە) لەو کاتەشداو لەنێو بازنە یەکبەدوایەکانیشدا جیاوازی نییە سەر ئەوەی سەربە چ نەژادو گروپێکی کۆمەڵایەتی و میللەتێکیت، چونکە جیاوازی لەنێوان عەرەب و عەجەمدا نییە تەنها جیاوازییەك هەبێت لە( تەقواکردندا) یە. کەواتە ئوممەتی ئیسلام مەرزەکان دەبڕێت و بەپلەی تەقواکەی جێ و ڕێگەی



دێت و دەپێورێت. بۆیە (مورشیدی کامیل.. دەبێ هەڵسونیشتنی مووبەموو لەگەڵ کردارو سوننەتی پێغەمبەری گەورەدا ڕێك بێت، موویێك لانەدات).

گوێگرتنی دووەم لەماڵی خوداوە دێت کە مزگەوتە. جارێ دونیا کش و ماتە. پێش نەغمەو جریوەی باڵندان. بەرلەوەی هەر چالاکییەك بنوێنرێت، گوێبیستی بانگدان دەبین و (فەرزە) کە شایەتی بدەیت ( کە هیچ ئیلاهێك نییە، جگە لەئەڵڵا.. پەیامبەریش نێردراوی ئەڵڵایە). ڕۆژی پێنج جار ئەمە ئاوی گوێی پێدادەدرێ. جگە لەوەی لەگەڵ لەدایکبوونماندا.. کە هیچ فراژبوونێکی جەستەیی و دەروونی لەئێمەدا پێنەگەییووە. بەگوێدا بانگدەدرێت بەناوی خوداوە ئێستا تۆ ناوت فلان کوڕی فیسارە...تاد.

ئێمە گەورە بووی نێوان هەموو ئەم دەنگە پیرۆزانەین و ئاگایی و نائاگاییمان بەم دەنگانە جۆشدراوەو شێلراوەو ئاخنراوەو سیخناخە.

وە هیچ یەکێك لەم دەنگانەش لەپەیامبەرەوە بیگرە هەتا موریدێك بەدیالۆگی نێوان دووکەس نەهاتووە. کەسێك دەنگ هەڵدەبڕێت.. تۆ دەنگ دەبیستیت. گرنگیش نییە تۆ تێدەگەیت یان نا.. ئەسڵی پەیام ئەوەیە فەرزێك هەیە، سەرنویشتی تۆیەو دەبێ هەمیشە لەزیکریدا بیت و جێبەجێبکرێت. ئەم (تەزکیەی نەفسیش) نابێت هەتا بێدەنگ نەبیت! مەگەر هەر ئەوکاتانە دەنگ هەڵبڕیت کە لەتەهلیلەدایت، تەهلیلەش زیکری خودایە بەدەنگی بەرز. ئەمەش دەچێتەوە سەر( زاهیری شەریعەت) و ( شەریعەتیش درەختە و تەریقەت پەلوپۆیین و حەقیقەتیش میوەکەیین)، لەبەرئەوەی جەستەی کورد لەنێو ئەو سنوورانەدا کە بۆ دیدو ڕوانینی

تاکڕەهەندانەی تورك و فارس و عەرەب غەریب و زیادەیە..و هەڕەشە لەقەوارەی ئەو وێنایانە دەکات کە سێ جەستەکەی تر هەیانە بۆ هەیبەتی خۆیان، چونکە هەم خۆیان بە( ئێوە چاکترین کۆمەڵن لەناو مەردمی دنیادا سەرو هەڵدا)دەزانن و تێدەگەن.. هەم نەتەوەی دەست رۆیشتوون و گەیەنەری( ریسالەتە)کەشن. ئەم سێ جەستەیە بەجیاوازی ئەو سوپەرئیگۆیە.. پەنامەکی و ئاشکرایانەی بۆ خۆیان دروستکردووەو رۆناوە، لەشتێکدا یەك دەگرنەوە، کە هەریەکەیان پارێزەری بەرقەرارکردنی گەوهەری ئیسلامن.

هەرسێکیشیان بەجیاو دابڕاو لەیەکتری سیستەمێکیان لەکۆن و تازەدا دامەزراندووەو تاقیکردۆتەوە کە ئایدۆلۆژییەتەکەی دین بووە، بەسەفەوی و عەباسی و عوسمانلیەوە. ئەم تەقواکردنەش نەك نەبووەتە مایەی برایەتی.. بەڵکو لەپراکتیکدا پتر بۆ دەستڕاگەیشتن بووە بەئامڕازگەلێك بۆ ( دەرکەوتنی خوود بەسەنتەرکردن) و رەتکردنەوەی رۆڵی ئەوانیتر. جا بەمانا دینییەکەی بێت.. یاخود مانا سیاسییەکەی.

بەهەڵەدا ناچین ئەگەر بڵێین: زۆرجار کۆك و تەبایی ئەوان تەنها لەبەرامبەر کەمایەتی و ئەو نەتەوەو گروپانەی سەر بەڕەگەزو ئایینی ئەوان نین و غەیرەن لەو ئایەتەدا خۆی نمایشدەکات کە دەفەرموێت:

(( آقتلوهم بالأهمال.......... ))

لە لەنگەرگای فەرهەنگی سیاسییانەو مێژووییشی هەموویاندا بێ جیاوازی مانادابووەو کارپێکراوە. بەد گومانکارییەکانیشیان هەر بەمانەوە نەوەستاون، بەڵکو پەیتا پەیتا هەژموونی جەستەی خۆیان



بەسەر ئەو غەریبەیەدا کە کوردە فراوان کردووە، هەتا لەچاوی ئەو وڵاتانەی بەجۆرێك لەجۆرەکان یاساگەلێك هەن کە بەرگری لەچەمکگەلی ئازادیی و مافەکان دەکەن، کورد بخزێننە کەناری نەبوونەوە و لەدەستی نەیەت بەدەنگ و زمانی خۆی جەستەی بریناوی و فەرامۆشکراوی خۆی بخاتەڕوو.. و بتوانن بەئاسانی و بەو شێوەیەی خواستی ئەوانە بوونی راستەقینەی کورد، چاودێرییبکەن.. و حەشار بدەن.. و دواتر لەچەندین رێگای ترەوە.. دەستەمۆییبکەن و لەخودی ئینسانیانەی خۆیشی پاشەکشێی پێبکەن و ئەو سەرکێش و یاخیبووەی بەرەنگاریش دەکات تەفروتونا بکرێت و ئەوەی دەمێنێتەوە نوزەبڕاوانە لەژێر زەبری ترساندن و سزا گەلێکی سایکۆلۆژیدا کەرامەت و کبریائە ئینسانییەکەی وێران.. و مەسخ بکەن.. و بێتامی بکەن.. و خۆی و مانا تێکشکاوەکانی خۆی لەبەرچاو بکەوێت.. و لەدواجاردا خۆی بۆ هەموو( ئەمر و نەهی )ەکی ( چاکە و خراپە)کانی ئەوان بەدەستەوە بدات و بگاتە خۆکوژیی ماهیەتی خۆی بەدەستی خۆی!

پێموایە..( جاشێتی و براکوژیش لەقوولاییدا، یەکێکن لەو رەمزو فیگەرە پاڵنەرانەی کارێکی وەهای کرد لەبوونی ئینسانیانەی خۆمان هەڵبێین و بێهێزبوونی دەنگی ئێمەو دەستەوەستانیمان لەبەرامبەر بەهێزبوونی دەنگ و پلان و دوورنماکانی ئەوان بخاتەڕوو، کە بەداوەشاندنی ئێمە شکاوەیەوەو خۆمان لەهەموو بەهایەکی بەرزی مرۆڤانە داماڵی و نکوڵیمان لەگەوهەرەکەی ئەو دروشمانە کرد خۆمان پێ ئارایشت کردبوو. هێرشی جاشەکان لەئەنفال و ئەتککردنی یەکتر لەشەڕە

ناوخۆییەکانی شاخ و شاردا باشترین بەڵگەی ئەو تراژیدیا ئەخلاقی و سیاسییەی ئێمەن، کە هێشتاکە بەپەرۆش نین ئەو رەگە ریشەداکوتراوەی کە لەبوارە جیاجیاکاندا ماوە دەربکێشین، پێشمانوایە ململانێی فیکری ئەمە لەئێمە دەخوازێت.. نەك دەستبەسەراگرتن).

پانۆرامای ئێمەو داگیرکەرە بێگانەکانیش هێندە تەمومژاوی و نارەواو ناهاوسەنگە، بەو مەودایانەی نێوانمان کە شکست پێدان و بچوککردنەوەو خوێناوییکردنی جەستەو رۆحی یەکترە.. هێندە قەیراناوییە، وا بەئاسانی و بێسەلامینەوە ناتوانین دڕدۆنگییەکانمان بڕەوێنینەوەو بچینە هیچ پەیمانێکەوە کە لەسەر بنەمای درۆ هەڵنەچنرابێت.

با لەدراوسێتییەکەی ئەم سێ جەستە گومڕابووەش رابمێنین و ورد ببینەوە، کە ئێمەیان لەنەخشەی پرۆژە جیدییەکانی کۆمەڵگای خۆیاندا ئیهمال کردووەو کردۆتە دەرەوە. لەگەڵ یەکتریدا ئاشتی پەروەر نین و پڕپڕن لەتێکشکانی مێژوویی و هەریەکەشیان بەبەڵگەوە بێت یان رەمڵ لێدان، دەرهەق بەنسکۆ و نشوستییەکانیان لۆمەو سەرزەنشتی ناڕاستگۆیی و تەڵەکەبازییەکانی یەکتر دەکەن. ئەو مێژووە رووگرژەی لەنێوان تورك و عەرەب و عەجەمدایە رۆشنەو بۆ رووهەڵماڵینی پەنجە درێژکردنی منی گەرەك نییە. گرێچنی تەنگژەو شەڕوشۆڕو گەندەڵ کارییەکانیشیان شاهیدی ئەوەن، کە تائێستا ئامادەنین و پێیان ناکرێت بەو میتۆدە تاکرەهەندە داخراوە بەپێچ و دەورە خوێناویی و پیلانگێڕییانەوە کە لەفۆرمی جیا جیادا هەر خۆی دووبارەو درێژ دەکاتەوە، بەهەماهەنگی پێ بنێنە قۆناغێکی ترو گرژییەکانیان خاو



بکەنەوەو نەهێڵن و لەسەر خوانێك کە لەسەر بنەمای مۆراڵێکی نوێی هەموویان بێت تەقەللابکەن و کۆببنەوە. خوانی ئاشتی و متمانەبوون بۆ یەکتر چێبکەن و بگێڕنەوە.

ئەوەی لێرەدا پێویستمان پێیەتی ئاماژەی پێبدەین ئەو راستیەیە، تێبگەین دراوسێتی لەسادەترین ماناکانیدا، لەسەر داڕماندن و مایەپووچکردنی ئەو مانایانەی، دەبنە خەسڵەت و پایەگەلێك بۆ دراوسێتی و راگیرکردنی بەهاکانی دراوسێتی بەرك بەرکێ و رێگریکردن لەچوونە ناویەك و کارلێکی ئەو مانایانەوە، کە رێز لەبنەمای چیەتی و نەریتی پڕ بەهایانەی هەریەکەیان دەگرێت.. نایەتەدی! نایەتەدی، چونکە پەیوەندییەکی ئاوها بارگاوی بەنابەرابەری و بێ متمانەیی و بەکەمگرتنی ماناکانی یەکتر و خوێن، جێگەو فەزایەك شك نابات بۆ گوزارشت لەئاقارو کۆی روانینە جیاوازەکان– واتە– شتێك نامێنێ بۆ گفتووگۆ لەسەر ئەو کۆدانەی پرۆسەی یەکترناسین و ئاشنابوون ئاسانتر دەکەن. بەومانایەی بەر لەوەی دەرگا لەسەر یەکتر بکرێتەوەو رووبەڕو ببنەوە، لەودیودەرگا داخراوەکان ( دامەزراوە سیاسی و کەلتووری)یەکانەوە، کە زیاتر مەنەلۆجین.. هەتا دیالۆگ بن، لەسەر ئەو وێنایانەی چنیوویانە، حوکم بەسەر وێنەکانی یەکتریدا دەدەن!

دیارە هەروێنەیەکیش لەسەر بنچینەی حوکمە پێشوەختە ستریۆتایپیەکان درابێتن، هەمیشە ستاتیکی ( پابت) و شێواو و لێڵ و ناتەواوەو پشت بەستوو نییە بەو ئارگۆمێنت و لێکۆڵینەوەو هەڵسەنگاندنە بێلایەنانەی دینامیکیەتی ( متحول) هەقیقەتە جیاوازەکان دەسەلمێنن.

لەفەزایەکی ئاوهادا لەبری ئەوەی ماناکان لەنێو یەکتریدا ئاوس بن و بزێن و واوەتر بەرزتر ببنەوەو چیەتییەکی تر ببەخشنە بونیادی خۆیان و ببنە مایەی ئەکتیڤکردنی میکانیزمەکانی خۆیان و ماناکانی یەکتر، دەبنە هۆی نابووتکردن و تیرۆرکردنی ئەو ماناو بەهایانە.

ئەگەر پەیوەندییەکیش هەبووبێت تەنهاو تەنها لەکایەی سوودخوازییەکی زووتێپەڕدا بووە، نەك لەهەناوی لێپرسراوییەتێکی هۆشیاری و شارستانیانەی وەهاوە هەڵقولابێت کە دابینکەری ڕێزگرتن بێت لەمافی تایبەتیەتە کەلتووری و مێژووییەکانی یەکترو تێگەیشتن بێت لێیان و ئەگەری دەوڵەمەندبوون و کرانەوەی زیاتری بۆ دەستەبەر بکەن، بێئەوەی سەروەرییەکانیان تووشی بەدگومانیی و سڵەمینەوەو ترسانێکیان بکات لەبەرامبەر بوونی یەکتر.

ونبوون و نەبوونی ئەو میکانیزمانەی تێکشکێنەری لەمپەرەکانن، بەپێچەوانەوە تەنگژەسازن و لەوێدایە زمانێك دەخەملێت تەنها کاری ئەوەیە بڕیار لەسەر چاکی و پاکیزەیی و بێگوناهی و نیازپاکی خود.. و خراپی و نغرۆکردنی ئەویتر دەدات.

ئەویتر ئەگەر هەڵگری خراپیەکیش نەبێت لەخودی خۆیدا، خراپیەك کە ئامادەیەو لەلایەن دەوڵەتی یەك فیکرو یەك باوەڕو یەکڕیزی و یەك ئامانجەوە بەرهەمدەهێنرێت پێوەی دەلکێنرێت و زەحمەتە لێی ببێتەوە.

لەبەر ئەوەی هەموو گەل و نەتەوە لەدەوری ئەو پەیام و دەرئەنجامە سوپەرمانایە چەقبەستووانەدا هەڵدەخرێنێت و بەگەڕ دەخرێن، کە ئەو ڕەوشە لەپراکتیکدا دژ بەوانە دەبێتەوە کە گومان لەو یەکڕیزی و



تاکڕەنگییە پۆلاین و پیرۆزکراوە دەکەن، کە زۆر سادە منداڵدانی تۆتالیتارییەتێکە لەناوەوە بونیاد دەنرێت، بۆ ئەوەی شوورەش بێت لەگەڵ ئەویتردا کەدراوسێیە.

لێرەوەیە دەتوانین بڕوانینەوە لەو حوکمە پۆلایینە پڕ لەهەراوهوریایەی لەعێراقدا پیادە دەکرا، کە چۆنچۆنی بەیاساو نەزمێکی نادادپەروەرانەو خاڵی لەهەموو ڕەوشتێکی مرۆیانەو شارستانییانە مامەڵەی لەگەڵ دەرودراوسێدا دەکردو لەناوەوەی خۆشیدا چ ماجەرایەك دەگوزەراو چۆن ئاسایشی نەتەوەو چین و گروپ و کەسێتیەکان بەنەبوونی دەسەڵاتی ئەقڵێکی کراوەو هەژموونگەری ئایدۆلۆژیای بەعس رزێنرا بوون!؟

لەناوەوە داننەنان بەشوناسەکانی ترداو نەبوونی پلۆڕاڵیەتی سیاسی و سڕینەوەی هەموو ئەو دەنگ و ڕەنگە جیاوازانەی دژ بەم ئەقڵیەتی دەسەڵاتخوازییە بوون. لەدەرەوەڕا هەڵگیرساندنی هەشت ساڵ جەنگ لەنێوان عێراق و ئێران، ململانێی دوورو درێژی ئایدۆلۆژی ڕاست و چەپی بەعسیانەی عێراق و سوریا.. داگیرکردنی کوێت، جگە لەغەدرە مەزهەبیەکان لەنێوان شیعەو سوننی و ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی و سەرهەڵدانی وەهابیەت، واتە لەو سێگۆشەی بەرمۆدایەدا لەنێوان تەراتێن و شەڕی ئەو فیلانەدا کورد، بەو گژوگیایانە دەچوو، کە تەنها دەبووهەوڵبدات بمێنێتەوەو نەفلیقێتەوەو هەلاهەلا نەبێت، دەبوو بەو لالە پەتەیەییەی خۆشمانەوە کە هەمووی بێدەنگیی بوو دەست بەشوناسی خۆشمانەوە بگرین لەنێو شانۆی دنیایەکدا کە هەمووی دەنگە دەنگ بوو!

لەکاتێکدا ئێمەی کرێچی و بێماڵ ( بەدیدی ئەوان) لەسەر خاك و مێژووی ئەو دراوسێ نەخۆش و شەڕەنگێزانە، دەشێ حاڵمان چۆن بووبێت و دەبێت؟ ئەوان لەشەڕەکانی یەکتردا سەرکەوت و بوونایە.. بەرزە دەماغی و گومڕاییەکەیان لەسەر جەستەی ئێمەش تاقیدەکردەوە. نوشوستیشیان بهێنایە ئەو تێکشکانە دەروونییەیان لەئێمەدا بەتاڵ دەکردەوەو تۆڵەیان لێدەکردینەوە. خۆ ئەگەر لێشمان نزیك کەوتنایەتەوە هەریەك بۆ مەرامێك بوو.. هەتا دراوسێکەی تری پێبخاتە تالووکەوەو ملکەچی عوقدە سیاسی و فیکری و مێژووییەکانی خۆی بکات. خۆ ئەگەر ئێمەش بمانویستبا سوود لەکەلێن و درزو کەلەبەرەکانیان ببینین.. هەموو ئێمەیان بەسیخوڕو گومانلێکراوی وڵاتەکەی دراوسێی دەزانی و دەدایە قەڵەم. بۆیە ئەنفال لەو ڕووبەرە ناتەندروستەدا ڕووداوێك نەبوو بەڕێکەوت و لەخۆوەو یان لەدالغەی سەرکردەیەکەوە هاتبێت و ڕوویدابێت، بەڵکو سەرەنجامی ئەو هۆیە ئایینی و سیاسی و مێژووییانەو قبووڵنەکردنی شەریکە بەشێك بوو کە بیریان لەگەڵدا بکاتەوەو لەفیکری ڕێگەچارەیەکدا بن، بەڵکو ئەو شۆڤێنییەتەیان وەها نابینای کردبوون تەنها گوێیان لەدەنگی خۆیان دەگرت و هەڵوەدا بوون بوو بەدوای ڕێگەچارەیەکدا کە بۆ ئەبەد نەك کورد بێدەنگ بکەن، بەڵکو واوەتر چووبوون و لەفیکری ئەوەدابوون بەیەکجارەکی لەڕەگەزی کورد ڕزگارییان بێت و لەهەمانکاتدا نیشاندانی گەردن کلۆفتی و پێشڕەوایەتیەکیش بوو بەو وڵاتانەی دراوسێ کە هەمان کێشەیان هەیە بەدەست کورد و کەمایەتیەکانیانەوە.



لەبەر ئەوەی کورد مێژوویەکی دوور و درێژ بەم هەموو پەتایانەوە لەگەڵ نەتەوەی سەردەستی دەنگ هەڵبڕ بەیەکەوە بووین، نەمانتوانیووەو ناتوانین هێند بەئاسانی خۆمان لەنەخۆشیەکانی ئەوان بپارێزین و ببوێرین. لایەنی کەم لەبەرئەوەی ئەوان بەقۆناغی دەوڵەت بووندا گوزەرابوون، بۆ ئێمە فەرهەنگێکی باڵاتربوون و هیچیان لەئێمەدا دروست نەکردبێ گرێی خۆ بەکەمزانینیان لەئێمەدا چاندووەو بەجێهێشتووە. ئەوەشی ئەو گرێیەی هەبێت، بێزمانەو هەمیشە بێدەنگە و ناتوانێت خۆی وەك خۆی ببینێت و بدوێنێت و بەدەنگی بەرزیش لەخۆی بدوێت. کەواتە هەر ئایۆلۆژیایەکی دیینی یان سیاسی خۆی بەیەکەم دەنگ و دوا دەنگی حەقیقەت ببینێ و وێنا بکات ئەم کارەساتانەی لێڕەچاو دەکرێت، فاشیەت، نازییەت، سۆسیالیزمیش لەو مۆدێلانەن. دەسەڵات و ئۆپۆزیسیۆنە ناسیۆنالیستی و کۆمۆنیستی و مەزهەبییەکانی لەمەڕ خۆشمان، خۆیان لەو خومخانە مەعریفیە سیاسی و فیکرییە هەڵکێشاوە. بۆیە ناتوانن جگە لەخۆیان هیچ مەیلێکی تریان قبولّ بێت!

دەرهەق بەوڵاتانی ئەوروپیش ئەوان دەزگا رەسمییەکانیان لەڕێگەی دوو دۆکۆمێنتەوە ئێمەیان بینیووەو دەبینن، وڵاتانی سێگۆشەی بەرمۆدا لەبری ئێمە ئاخفیون و شوناسەکەمان ئەوەبووە کە چاوی ئەوان بینیویەتی و زمانی ئەوان گوتویانەو میتۆدی ئەوان سەلماندویانە، چونکە بەپێی ڕێکەوتننامە نێو دەوڵەتییەکان ئێمە سەر بەو وڵاتانەین و ئەمەش خەڵات و دەست و دیاری کۆڵۆنیالستەکان خۆیان بوون بۆمان مایەوەو گومرگەکەی دەدەین. باسیشمان کرد ئەو وڵاتانەی سێگۆشەی بەرمۆداش

بۆ خۆیان پڕ ئاژاوەو ناسەقامگیرن، جا تۆ وەرە شەرحی قوربانی بدەیتە دەست جەللادەکەی چی دەردەچێت؟

دۆکۆمێنتەکەی تریش لەلایەن ئۆرینتالیستەکانەوە ( رۆژهەلاتناسەکان ) بووە، کە خۆیان سەر بەدەزگا رەسمییە کلێشەبازە بیرۆکراتەکانی ئەوروپا خۆی بوون، کە وێنەی سەرپێی و رووکەشیانەو تێکدراوی ئێمە بوون. کەوابێت ئێمەی سەرکۆنەکراو، کەوتووینەتە ژێر کۆمەلێك بێدەنگیی چین بەچینی کۆن و تازەی کەڵەکەکراوەوە.

بەپێی هەرەمی سیاسی نێودەوڵتیش ئەم وڵاتانەی سێگۆشەی بەرمۆدا بەپێی بۆچوونی سەمیر ئەمین لەپەڕاوێزی وڵاتانی پەراوێز بووی سەنتەردان. ئەمەش عوقدەی بچوکبوونەوەو خۆ بەکەمزانینی تیا بەجێهێشتوون. کوردیش دەبێت بەپەراوێزی پەراوێز کەوتووەکان. واتە دەنگێك لەکورد بێتە دەرەوە بەکۆمەلێك تەرجومەو فیلتەری سیاسی و دیبلۆماسی و کەلتووری و ئەخلاقی عوقدەدارەکاندا دەڕوات و ئینجا دەگاتە دەست دەسەڵاتە جیاوازەکانی ئەوروپی! گرفتێکی تریش ئەوەیە کورد لەنێو بونیادی کۆمەڵایەتی و ئابووری خۆیدا فۆرمی وەرنەگرتووەو بەدرێژایی مێژووەیەك چەپێنراوە، بۆیە خۆی بەلاسایکەرەوەی نەتەوەی سەردەست دەزانیّ و زانیووە، بگرە بەئاگایی یا نائاگایی هەڵگری رەوشەکانی ئەویشەو لەزۆر بواردا هەروەك ئەو رەفتار دەکاتەوە. ئەگەر ئەو رژێمانە کوردیان بێدەنگ دەکرد بەهەر هۆیەك بێت کە هەندێکیمان خستەڕوو. هەنووکە کورد وەفادارە بەم حیکمەتی دەسەڵاتدارییەو خۆی خۆی بێدەنگ دەکات. بۆیە سەیر نییە کە سەرکردەیەکی کورد دەرهەق



بەدیسپلین.. لەدانیشتنێکدا گوتبێتی: (( سەرکردە دەبێت وەك سەدام حوسێن بێت)). وە کورد ئەو ساتەوەختە دەتوانیّ لەجیهانە داخراوەکەی ئەوان دەرباز بێت. کە زمانی لێسەندراوی هەر چین و توێژ و گروپێك بگێڕێتەوە بۆ ناو دەمی خۆی و بەگفتوگۆو دانوساندن و بەیەکتر سەلماندن و دەنگدان و دەستاو دەستکردنی وردە دەسەڵاتەکان خۆی ئاوەڵا بکاتەوە. ئەمەش ئارەزوویەك نییە. هێندەی ناسینی ئەو فرە میتۆدەییەیە کە مەیلە جیاوازەکانی کۆمەڵی پێدەناسرێت و پێدەخوێنرێتەوەو دەستنیشانی جێگەو رێگەیان دەکات و لەڕێی حوکمەتێکەوە کە بەیەکێتییەکی ئارەزوومەندانە، بەپێی دەستوورێك کە گوزارشت لەکۆی بەرژەوەندییە ناکۆکەکان دەکات پێکهاتووە. لەو کاتەدا حوکمەت شتێك نابێت، جگە لەئیدارەی ئەو بەرژەوەندییە جیاوازانە، کە لایەنگرییان ناکات و دژیشیان ناوەستێت و هەموویان بەخۆی دەزانێت و سەروەرییەکەی تەنها لەهەوڵی ئەوەدایە چۆنچۆنی ئیدارەیان بدات. کە ئەم پرۆسێسە غایب بوو. چاوەڕێکراوە سەرکردەیەك بێت و لەڕێی میدیای حیزبەکەیەوە راشکاوانە بڵێت (( هەتا ئەندازیارێکی حیزبی وەستابێت، کار فەراهەم نییە بۆ ئەندازیارێکی غەیرە حیزبی)). داخوا ئەم جیاوازیکردنەی مافی هاوڵاتیان بەپێوانە حیزبیەکان، هەمان فەرهەنگی بەعس نییە بەمیرات ماوەتەوەو درێژبووەتەوە بۆ نێو فەرهەنگی سیاسی ئێمەش؟ ئەگەر ئەمە وەفاداری ئێمە بێت و هەموو نەتەوە کورت بکەینەوە بۆ نێو حیزب، کە دەنگی راستەقینەی نەتەوەیە. کەواتە دەنگەکانی دەرەوەی حیزب دەنگی گومانلێکراو و زۆڵ دەردەچن. ئەمە

دەلیلـی نـەبوونی یاسـاو ڕێسـایەکە کـە هاوسـەنگییەك لـەنێو مەیلـە جیاوازەکاندا پێکبهێنێت و هیچ دەسەڵاتێك لەسەروو یاساوە نەبێت، بەڵام یاساکانی لای ئێمـە غـوڵامی ڕەهبـەرە سیاسـەتبازە عوقـدەدارەکانمانن و ئێمەش ڕادەهێننەوە لەسـەر توندو تیـژی و ژاوەژاو و نەخۆشـییەکان بـۆ یەکتر دەستاودەست پێدەکەین و گیانی نیشتمانپەروەری دەبێتە نوکتەی خۆش.

ئایا ئەمەش دیسان ڕاهێنانەوەمان نییە لەسەر دەستبەسـەردا گـرتن و بێـدەنگکردن؟ چ کەسـێکی هۆشـیارو دەروون سـەرفراز دەتـوانێ بـڕوا بەدەسەڵاتێك بکات و چاوەڕوانی لێی هەبێت، کە هـاوڵاتیبوون لەڕوانگـەی پێڕەوی ناوخۆی حیزبەکەیەوە تێدەگات و دەبینێ و بەشکۆدارییەوە مـافی حیزبیـەك دەدا بەسـەر ناحیزبییەکـداو بـاس لەکەرامـەت و ئاسایشـی نەتەوەش دەکات. دەسەڵاتێك ئاوها گومڕایانە بدوێت، سەیر نییـە هـەموو شتێك قۆرخ بکـات بـۆ خـۆی و لـەززەت لەزرنگاندنـەوەی دەنگـی خـۆی و لـەکڕبوون و بێـدەنگکردنی غـەیرە حیزبیـەکان ببینێـت! ئەمـەش پێماندەڵێت: شەڕی ئێمە لەگـەڵ ڕژێمەکانـدا بـۆ دابەشـکردنی دەسـەڵاتی حیزبـی بـووە.. نـەك بـۆ گێڕانـەوەی ئـەو دەنگانـەی لێمـان زەوتکرابـوو، داخوازو چاولەدووی جێگیرکردنی مۆڕاڵ و بەهاگەلێکی ئینسانی بـوون کـە جێگـەی حەوانـەوە و تـەبایی هـەموو مەیلـە جوداکـانی کۆمـەڵگا بێـت وەکویەك.



**پرسیار:** ئـەو هۆکارانـە چـین کـە ئـەنفال لەهۆشـیارییەکی سیاسـی سادەوە کە تـەنها لـەیاد کردنـەوەی سـەرپێیانەی ساڵانەدا قەتیسـبووە، دەگوازێتەوە بۆ هۆشیارییەکی کەلتووری، لـەو بێدەنگییـەی کـە خـاوەنی قسە نییە دەگوازێتەوە بۆ بیرکردنەوەیەك بـەدەنگی بـەرز. هـەروەها ئـەم بێدەنگییـە چـەند پەیوەنـدی بـەکورد خۆیـەوە هەیـە، هـەم لەئاسـتی بەرپرسیارییەتی کۆمەڵگای کوردی بۆ ئەنفال و هەم لەئاستی دەسـتەڵاتی کوردی خۆیدا.

**ئەنوەری ڕەشی عـەوڵا:** بەشـێوەیەك بۆمـان ڕۆشـنبووەوە یـادوەری کورد، یادوەرییەکی بێدەنگ کراوە، کەس و گروپی بێدەنگکراویش لەگەڵ هەر فرسەتێکدا کە بۆنی ئازاد بوونی لێبێت، یەکەم کاردانەوەی بەشڵەژان و بێسـەروبەرەیی و ژاوەژاو دەسـتپێدەکات و دەردەکـەوێت. بـۆ خـاتری ئەوەی وەڵام بەو بێدەنگکردنە دوورودرێژە بداتەوە کە لەپشتیەوەیەتی و جڵەوکێشی کردووە، بەڵام نازانێ چۆن! هاواردەکات بژی.. بڕوخێ، بەڵام ناتوانێ بەقووڵی بیربکاتەوە دەربارەی ئەو شتەی بـەیانی دەکـات. جنێـو دەدات، بەڵام خەون بەئەخلاقی بەرزی شۆڕشگێڕانەشەوە دەبینێت جارێك دەبێتـە ئۆپۆزیسـیۆن و لـەداخی ئـەوەی دەسـەڵات لەئاسـتیدا کـەمکارو خەمساردەو نابینای دەگرێت ئەمیش تەڕو وشك دەسـووتێنێت و ئەمـەش بەڕادیکالیـەت تێـدەگات. جارێـك هـەموو شـتێکی قبوڵـەو دەڵێـت: بـاوکم کۆمەڵێکی دواکەوتووی وەك ئێمە هەروا دەبێت و ئافەرم بـۆ ئـەو کەسـەی

سوود لەم فرسەتە دەبینێت. جارێك هەموو شتێكی رەفزەو گەرەكیەتی هەموو شتیك بۆنی بێگوناهی و پاكیزەیی لێبێت. جارێك پێدەكەنێ بەمێژووی كۆشش و خەباتی خۆی و جارێك گاڵتەی بەهەمووشتێك دێت. یان دڵی بەهەموو شتێك خۆشەو ئالودەی تێكەڵی و پێكەڵییەكی سەیر دەبێت!

تێكەڵ و پێكەڵە، چونكە هیچ شتێك رێكنەخراوەو بەئۆرگانیزە بووندا نەگوزەراوە، تەنها رێكخراو بوونی حیزبی نەبێت بەدەوری ئایدۆلۆژییەتێكدا. رێكخراو بوونیش بەپلەی یەكەم، هێزی خۆی ئامانجەكەیەتی.. نەك مرۆڤ. مرۆڤبوون بەهەموو رەهەندی ئازادیی و مافەكانییەوە بەپێودانگەكانی خۆی دەپێوێت و بەگەڕدەخاو لابەلا دەكاتەوە.

ئەو شەڕانەشی حیزب بەرپایاندەكات، لەدواجاردا هیچ نین جگە لەسەپاندن و فەرزكردنی ئەو بڕوایانەی ئایینامەی كاركردن و جیهانبینییەكەین، چونكە هەرحیزبێك جەماوەریبوون و پێشڕەوایەتییەكەی هەرچییەك بێت ناتوانێت تان و پۆو دەنگ و رەنگی هەموو نەتەوە بێت بەگشت گروپ و وردە كەلتوورەكانییەوە.

جا ئەگەر چەمكی كەلتووریش لەسادەترین پێدراوەكانیدا: ( چەند گروپێك لەخەڵك بەیەكەوە دەبەستێتەوەو یەكیان دەخات و بیروباوەڕ، ترادیسیۆن، داب و نەریت، بەهاو فێربوونەكان دەگرێتەخۆ. جەوهەری تایبەتی خۆی لەسەر كەسایەتی ئەو مرۆڤانەی پەیوەستن پێیەوە وێنا دەكات...تاد ) ئەگەر ئەم بنەمایە نەبوو هەر بنەماڵەو گروپە بەپێی



بالادەستی و هێزی ئابووری و سیاسی و سەربازی خۆی لەهەوڵی ئەوەدایە گروپەكانی تر مەسخ و رەنگرێژ بكات.

بۆ نمونە مرۆڤناسی ئەمەریكی- راس بێنەدیكت- لەكۆمەڵگا سەرەتاییەكاندا، كەلتوورەكانی دابەشكردووە بۆ دوو جۆری ((فەلسەفی)) و ((پاڵەوانی)). لەناو كەلتووری فەلسەفیدا.. حاڵەتەكانی وەكو قەناعەت، ئاشتیخوازی، میانڕەویی و یەكسانی و ئارەزوو بۆ ژیانی هاوبەش، بەئاشكرا زاڵە.

لەكاتێكدا لەناو كەلتووری پاڵەوانیدا رەفتارەكان پشت بەشەڕخوازیی، ناكۆكی و بەربەرەكانی، ململانێ، سەربەخۆییخوازیی و پلەوپایەخوازیی دەبەستن. ئەزموونەكان لەناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست پیشانیداوین كە كەلتووری پاڵەوانبازێتی زمانحاڵی زۆربەی ئەو گروپانەیە كە دەسەڵاتیان بەدەستەوە بووەو هەیە. كوردستانیش دەكەوێتە ئەو خشتەیەوەو جەنگاوەرێك زۆر بەرێزترو بەشكۆترو بە بەهاترە لەرۆشنبیرێك و هونەرمەندێك و رۆژنامەنووسێك. لەكاتێكدا بەپێی سیستمی كەلتووری، بەرهەمهێنەرانی كەلتوور.. واتە: نووسەران، هونەرمەندان، شاعیران، دەرهێنەران لەناوەڕاستی سیستمی كەلتووریدان.

كەچی لەفەرهەنگی بالادەستكراوی ئێمەدا.. لێپرسراوی سیاسی وا هەیە بەئیفتیخارێكەوە گوتویەتی: كام شاعیرە زۆر بەناوبانگە بەچارەكێ عارەق هەڵیدەپەڕێنم! مەئەساتەكە لێرەدایە هەموو بنەماكان قڵپ كراونەتەوەو ئەوەی ئەندێشەو رونیاو هزر لەمەیدانی كەلتووریدا دەجوڵێنن و دەسازێنن سیاسەتبازەكانن. سیاسەتبازێتیش لای ئێمە هەموو مۆڕاڵی

کۆمەڵگا لەکڵێشەی ئایۆلۆژییەتەکەیەوە هەڵدەهێنجێ و سەراپا جومگە هەستیارەکانی کۆنترۆڵ کردووە هەر لەدامەزراوە کەلتوورییەکان و دیاردە کەلتوورییەکانەوە هەتا مەرامە کەلتوورییەکانیش.

ئەم نمایشە کورتەم بەخاتری ئەوە نیشاندا هەتا پلەبەپلە ڕێگایەک بکەمەوە بۆ چوونە سەر ڕەگی پرسیارەکەی بەڕێزتان، بۆ تێگەیشتن و ڕۆشنبوونەوەی ئەو گرفتانەی کە بۆچی ئەنفال لەهۆشیارییەکی سیاسی سادەوە ناگوازرێتەوە بۆ هۆشیارییەکی کەلتووری! لەبەرئەوەی بونیادو هەیبەتی کەلتوور بچوککراوەتەوەو ئاخنراوەتە بەرنامەی حیزبەکانەوەو خاوەن حیزبەکانیش خاوەنی هەموو شتێکن!

هەنووکە ئەوە قوتابخانە فیکرییەکان نین ڕێنوێنیمان دەکەن کە ئایدۆلۆژیاو باوەڕپێهێنراوەکان و بەهاکۆمەڵایەتییەکان و کارو ژیانمان بپشکنین و بەپێی هەلومەرجەکان خوێندنەوەی تازەیان بۆ بکرێت و گەشەیان پێبدرێ و ئاراستەی تر وەربگرن، بەڵکو ئەوە دەزگا حیزبیەکانن بەهای هەر شتێك دەردەخەن و ڕەفتارو نۆرمی جۆراوجۆری پێدەدەن و نەتەوە بەدەوری سەرۆك و دروشمەکانی خۆیاندا کێش و باوەخولێ پێدەکەن. حیزبیش وەك هەر گروپێکی تر لەسایەی ڕژێمە دیسپۆتیستەکانی پێش خۆیدا خۆی بەقوربانی یەکەم دەبینێ و کۆمەڵگا بەهەموو شێوە جیاجیاکانی چەوساندنەوەو چەپێنرانەکانییەوە لەسەر خۆی ناونووس دەکات و سیستمی بۆری ئاو و کارەباو جادەوبانی بۆ چارەسەر ناکرێت، کەچی سیستم بۆ نوسین و تێکستی نووسەران و



ڕۆژنامەنووسان و بیرکەرەوەکان دادەمەزرێنێت و مەرزی ئەخلاقەکانمان بۆ دەکێشێت.

لەو بارودۆخەدا کە غیابی ئەخلاق و خەون و بیرکردنەوەیەکی ئینسانیانەیە هەر گروپەی دەخوازێ وەڵامی یەکەمین بەمەحرومیەتەکانی خۆی بداتەوەو ئاگر بۆ کوورەکەی خۆی بدرێت. ئەمەش ئەو ژاوەژاو و گەڕەلاوژەیە بەرهەمدەهێنێ کە ئاماژەمان پێکرد. بۆ ڕێکخستن و بەڕێوەبردنی ئەو کێشانەش.. دەشێ دەستوورێك هەبێت کە ماف و ئەرکەکان سکۆلارییانەو پتەو بەشێوەیەکی دادپەروەرانە لەبەرامبەر یەکتریداو بەیەکەوە لەخۆبگرێت و بەپێی پەیمانێکی کۆمەڵایەتی دەسەڵاتەکان لەفەوزاوە بگۆڕێت بەسیستم.

داخۆ ئەم کارانە بەهۆی هەژموونی حیزبەکانەوە ڕەخساون و دەڕەخسێنرێن؟ پانێڵێکی ئاوهامان هەیە کە کۆدەنگی هەموو دەنگ دەرهاتووەکان و دەزگاو دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان بێت بێ گۆتکردن و سڕینەوەیان؟ یاخود حیزب ئەختەبووتێکەو پەلی هاویشتووە بۆ نێو هەموو کایە کۆمەڵایەتییە جیاجیاکان و لەبری هەموویان بیردەکاتەوەو دەئاخفێ و بڕیار دەدات و ئەمەش بەئەرکی مێژووکردی خۆی دەزانێ و ئێمە بەس لەسەرمانە ببیستین و پێڕەوی لەو فەرمایشتانە بکەین هەتا نان بڕاونەبین و تڕۆمان نەکەن!؟ هەرکاتێ حیزب لەئاماندا بوو ئەوە جەماوەر لەبەخششەکان بێخەبەرە و ئەگەر لەتەنگژەشدا بوو، دەم و دەست هاوار بۆ نەتەوە دەبرێتەوەو جەماوەر تاجی سەرو سەروەرە.

بەکورتی و کوردی ئێمە لەگێرفانی کەلتوورو مەعریفەی تاکڕەهەندانەی سیاسی ناوچەکە هاتوینەتە دەرێ و قولانجێك نەچوینەتە ئەولاوەو ناشمانەوێ بچینە ئەولاوە، بەڵگەنامەکانیش پێماندەڵێن: ئەم لەوەڕی دەسەڵاتدارێتییە بۆ درێژەدان بەخۆی ئەم دەبڵ فەیسی (دووڕوویی سیاسی) دەخوازێ و – دەکارین بەدیبلۆماسیەت ناوزەدی بکەین، چونکە دەسەڵاتدارێتی لەڕۆژهەڵاتدا ئەمەی پێویستەو نامانەوێ پلەوپایەمان بەهەندێ فەنتازیاو خەونی شاعیرانە لەدەست بچێ و بچین – ( ئەمە زەمزەمەی سیاسەتبازەکانی فەرهەنگی سیاسیانەی لای ئێمەن).

هاوڕێی ئازیز.. پێشچوون بەخۆزگەو هوتافات و بانگەشە نایەتەدی، بەڵکو میکانیزمی خۆی هەیەو دامەزراوی کۆمەڵایەتی وردە کەلتوورە پیشەییەکان.. ئەتنیکیەکان.. ئایینییەکان.. ناوچەییەکان.. لادێنشینەکان...تاد ڕۆڵیان هەبێت لەزیندوڕاگرتنی بەهاکانی خۆیانداو لەڕێگەی کارلێکی کۆمەڵایەتی و سیاسیانەدا لەچوارچێوەی نەتەوەدا بەهاوبەشی بژین و درشتە کەلتووری نەتەوە بەڕەنگ و رووی تایبەتییەتی وردەکەلتوورەکانی خۆیان ببینن و بزانن.

ئا لەو ئاوێتەبوونە ئارەزوومەندانەدایە هەرسێ چەمکی ( کۆمەڵگا و کەلتوور و کەسێتی) لەلای– رالف لینتۆن– جیاکردنەوەیان لەلای تۆژەرەکان بەزەحمەت دەزانرێت.

کەچی جینۆسایدی ئەنفال کە زیاتر لادێنشینەکانی گرتەوە، لەلایەن وردە کەلتوورەکانی شارەوە، نە هەستیان پێکراوە.. نە بیریان لێکردۆتەوە. لەبەر ئەوەی لادێنشینەکان دەنگی راستەقینەی خۆیان



بزرەو لەلایەن حیزبەکانیشەوە تەنها بووە بەکەرەستەی بانگەشەو بێخەیاڵن لەچەرمەسەری و میحنەتەکانیان. ئەوەتا یەکێك لەسەرکردەکان بەدڵنیاییەوە دەرهەق بەئەنفالکراوەکان لەچاوپێکەوتنێکدا دەڵێت:( وەختی خۆی کە ئیدارەی هاوبەش هەبوو لەنێوان یەکێتی و پارتیداو پەرلەمان دروستبوو، بڕیار بوو لەو بارەیەوە شتێك بکەن و رایبگەێنن کە ئەوانە نەماون بۆ ئەوەی چارەنووسیان مەعلوم بێت، بەڵام دوایی دواکەوت، بۆچی دواکەوت نازانم؟ بەڕاستی دەبوو زۆر زووبکرایە، چونکە ئەمە مەسەلەیەکی قانوونی و مەسەلەیەکی شەرعی زۆر زۆر ناسکە ! !)

ئەی سەرکردەی واقیعبین و دووربین! ئەگەر تۆ نەزانی بۆچی دواکەوتووەو لەهەمانکاتدا مەسەلەیەکی قانوونی و شەرعی زۆر زۆر ناسکیشە.ئەی کێ دەیزانی لەودیو دەرگاکانەوە چی دەگوزەرا.. لەبەرامبەر چاوەڕوانی بێهودانەی چەندین ئافرەت کە شوویان نەکردۆتەوەو لەڕووی دەروونی و کۆمەڵایەتی و عاتیفیەوە کێ لێپرسراوە.. داخوا نمایندەی ئەو خەڵکە کارەستبارەتان لابوو و مۆڵەتتان پێدان هەتا بەزمانی خۆیان بدوێن و گوزارشت لەخۆیان و رێگا چارەیەك بکەنەوە دوور لەتەفسیراتی ئێوە؟!

ئایا ئەمە فەرامۆشکردن نییەو ناگەێنێت.. بەمانا ئۆنتۆلۆژی و سیاسی و کۆمەڵایەتییەکەی؟ ئایا ئەم بێدەنگی و بێدەنگکردنە رۆنەچووە بەمۆخمانداو نەبووە بەبەشێك لەکەلتووری سیاسیمان؟ هەموو بەجۆرێك لەجۆرەکان تاوانبار نین، دەرهەق بەنیوە تیرۆرکراوەکەی لەشی خۆمان. لەڕووی سایکۆلۆژییەوە ئەمە مومارەسەکردنی جۆرێك لەماسۆشیەت

نییە.. لەبەرامبەر دوژمنداو بێداربوونەوەی سادییەتیش نییە لەبەرامبەر یەکتریداو خەمسارد لەبەرامبەر خانە مرێنراوەکانی جەستەی نەتەوەدا؟ ئاخۆ لەنێو ئەو بێسەروبەرییە سیاسی و کەلتوورییەدا بە– مانا کۆمەڵناسیەکەی– وە کۆنترۆڵکردنی هەموو جومگەکانی کۆمەڵدا چۆن کارەساتی ئەنفال دەگوێزرێتەوە بۆ هۆشیارییەکی کەلتووری؟

لە بری ئەوەی کەلتوور زەمینەیەکی وەها بسازێنێت کە خود لەگەڵ خۆی و ئەوانی تردا ئاشتبکاتەوەو تاکەکانی کۆمەڵایەتی بکاتەوەو بەئیرادەیەکی چاوساغانەوە نە کوێرکراوەوە پێویستییەکانی بناسێتەوەو هەڵبژێرێ. دێین و بەحیزبیان دەکەین و لەمەنگەنەی ئایدۆلۆژییایان دەدەین و ناهێڵین خاوەنی خودی خۆیان بن. نەبادا بەیانی لێمان قیت ببنەوەو چەقوەسووانە زماندرێژی بکەن و بەکاڵفامی خۆیان یاخی بن! ؟

پێموایە رێکخستنی مەدەنیانەی خەڵك بەموگناتیسێك دەچێت، کە لێی دراو فڕێ درایە ئاگرەوە.. خەسڵەتی موگناتیسیانەی خۆی وندەکات و لەدەست دەدات، بۆ ئەوەی خۆی رێکبخاتەوە دەبێ ئەو ئاسنە کە پێشوتر موگناتیس بووە لەموگناتیسێکی تر بخشێنرێتەوە هەتا ئاراستە تێکچووەکانی خۆی دابمەزرێنێتەوە.

لێرەدا بنۆڕە حاڵی فێرکردن و پەروەردە لەڕووی پێکهاتەو شێوازو مەنهەجیەتەوە لەجاران داوەشاوتر نەبێت، باشتر نییە. بنۆڕە بەفەرمانی فلان سەرکردە قوتابخانە دەکرێتەوە، خەستەخانە دادەمەزرێ.. خەڵك دەنێردرێت بۆ دەرەوەی وڵات، بناغەی کۆمپانیا دادەڕێژن، ئەی وەزارەتە پسپۆڕەکانمان کاریان چیەو بۆچی دانراون؟



بە بەرچاوانەیەو مەتەڵ نییە، بەهاکانیش لەنێو پەسەندی رەنگە حیزبییەکاندا کفن و دفن کراون و چاودێری کۆمەڵایەتی.. داب و نەریت و نۆرمەکان.. بیروباوەڕەکان.. سیستمی ژیانی خێزانی، قاڵبەکانی قەزاو قەدەرو دەستی ئاسنین دەیانبات بەڕێوەو لەجیاتی زمانپژان بەئەگەرە تاقینەکراوەکانی خۆی.. بەتێرو تەسەلی بەزمانێکی دووبارە بووەوە لالْمان دەکەن.

دەسەڵات.. لەکەلتوور هیچی ناوێت، تەنها ئەو ئەخلاقە بەرزەی لێیدەوێت، بەئەندامی خێزان و قوتابخانەو مزگەوت و دامەزراوەو دەزگاکان بقەبڵێنێت ( ئەوەت بوێت کە من – حیزب– بەباشی دەزانم بۆت و کڕبە ! )، چونکە ئێمە پێشڕەوایەتیتان دەکەین. ئیتر ئەوە ئەخلاقی سیاسییانەی رۆژهەڵاتەو ئاوا براوەو دەڕوات بەڕێوە. بەڵێ کۆمەڵایەتیبوونەوەش لەدوا شرۆڤەدا یەعنی وابەستە، بەحیزبیبوونەوەی ئارەزووە بەردەوامە هاوبەشەکانتان، لەمە زیاتر بترازێت ئاسایشی نەتەوە دەکەوێتە مەترسییەوە! چونکە پەیوەندی، هێز، بیروباوەڕ، هەست و سۆزی نەتەوەیی، یەعنی باڵادەستی حیزبیبوون!! ئەم کرمەڕێزبوونەش بەجیاوازی فۆرمالیستانەی ناسیۆنالیست و ئیسلامی و سۆسیالیستییەکان لەجەوهەردا لەڕووی فیکرییەوە یەك شتن و هەریەك پێیوایە خۆی نمایندەی حەقیقەتە بۆ چین و نەتەوەو لەدوورنماکانی ئەوان زیاتر هەموو بزوتنەوەیەکی تر گومانلێکراوە. ئەمەش ئەو میراتە دینییەیە( چۆن هیچ ئیلاهێك نییە جگە لەئەڵڵا) زیاتر!!

لەنائاگایی سیاسی و ئایدۆلۆژی هەموویاندا کاردەکات و لێیان دەخورێ و ئەوانیش خەڵکی مێگەل ئاسا لێدەخورن.

لەزمانی هەموویانەوە، لەم راستیە مێژووییە بترازێ ژێدەری هەموو توێژینەوەیەك ئاژاوەچێتیە.. دووربینییەکیش گەر هەبێت جۆرێکە لەگێرەشێوێنی منداڵانەو بەتاڵە. ئێمە چەندین ساڵە خۆبەخشانە بەشاخەوە بووین کۆمەڵگای ( کۆمەڵە گای) خۆمان بەهەست و پێستەوە باش دەناسین.

هێشتا لەسەرەتادایـن، خۆ ئێمە ئەوروپا نین.. بۆیە دەزانین لەچ کۆلانیکدا ئازادی پێدەدەین و لەچ شەقامێکدا لێیدەسێنینەوە. فێری ئەوەیان دەکەین رۆڵ و سنوورو بەکارهێنانیان بەچ شێوەیەك دروستەو دەڕوات بەرێوە بەخزمەتی چینی کرێکارو نەتەوەی کوردو ئوممەتی ئیمانداری ئیسلام! ئێمەش هەر ئەوەمان بۆ دەمێنێتەوە وەکو جاری جاران بەدوای دروشمەکانیاندا ببۆڕێنینەوە((هەلهۆلە لیلحیزب صامد)).

کەلتووری وڵاتە کراوەکان کەلتووری بیستن نییە بەتەنها، بەڵکو کەلتووری ئازادی بینین و گفتوگۆو سەلماندنیشە. هەتا بەبێشەرم و ترس و تۆقاندن. دەنگ هەڵبڕێت و بتوانرێت نهێنییەکان بپشکنن و هەڵکۆڵن و لەڕاستی و دروستیان بەشێوەیەك لەشێوەکان دڵنیابن و شتەکانی ئایین بدەنەوە بەئایین و حیزب بدەنەوە بەحیزب و پەروەردە بدەنەوە بەپەروەردەو حکومەت و دامەزراوەکان بدەنەوە بەخۆیان، بەپێی پەیمانێکی کۆمەڵایەتی. بۆ ئەوەی بەریەککەوتن روونەدات.. خۆ ئەگەر رووشیدا کەمتر بێت و چارەسەری بۆ بدۆزرێتەوە. وەکو ترافیك لایت



دەبێ نیشانەکانی هاتوچۆ هەبن و بایەخەکانی بخرێتەڕوو. ئەگەر سێگۆشە هەبوو لەلای تۆوە، هەقی ئەویترە بڕوات. کە نووسرا بوو ستۆپ هێواشی ناکەیتەوە، بەڵکو دەبێت بوەستیت..تاد.

تۆ بڕوانە لەوڵاتە پێشکەوتووەکان.. لەسیستەمی ڕێگاوبانیانەوە دەبینیت و تێدەگەیت سیاسەت لەو وڵاتەدا چۆن بەشێوەیەکی ناچۆڕاڵی دەڕوات بەڕێوەو لەهەولی ئەوەدان چۆن ماشێنەکان هاتوچۆ دەکەن تاك و گروپ و چین و توێژەکانیش دەچن بەڕێوەو کەمترین بەریەککەوتن روودەدات. لەمەوە هەرکاتێ سیستەمی ڕێگاوبان کە بەدەمارو مولولەکانی جەستە دەچن چاکرا، ئەوا تێدەگەین ئەو کۆمەڵە نزیك نەبووەتەوە لەسەکتەی دڵ و دەماغی کۆمەڵایەتی!

**پرسیار:** ئەو پێشنیازە تایبەتیانەی ئێوە چین. بۆ ئەوەی ئەنفال وەك کارەساتێکی سیاسی مێژوویی لەیادوەری ئینسانی کوردا بەچەشنێك بمێنێتەوە کە هەمیشە جێی ئاوڕدانەوەو قسەکردن بێت لەسەری لەلایەن ئەو نەوانەی کە لەدوارۆژی کۆمەڵگای ئێمەدان؟

**ئەنوەری ڕەشی عەولا:** دەشێ نەوەی نوێ ئێستای خۆی بناسێت. ئەو ئەمێستایەی بەژیان و بوون و خودێتی ئەو نامۆو تەکولۆ نەبن و لەوێوە بچێتەوە سەر ئەو گرفت و کێشەو مەرگەساتانەی بەشێکی زۆریان لەیادوەرییەکەی داگیرو داغان کردووەو پاشەڕۆژیشی لا نارۆشن و لا بەدبین دەکەن. ئەمەش هەروا ئاسان نییەو ناچار دەبێت خۆی بۆ کۆمەڵێ

جەنگ ئامادە بکات. یەکێك لەو ئەرکە بەراییانەش کە ئەو جەنگە ئەقڵانییە پێویستێتی ئەوەیە.. تێبگات کۆمەڵ لەبن کەناری حیزبیەتدا، دەنگی دەرنایەت و بوونە راستەقینەکەی شێوێنراوە، تەنها رێگایەکی کاربڕو نوێش ئەوەیە بەدوی ئەو رێگایانەدا هەڵوەدا بێت، کە ژیان و بوون و خودی ئینسانیانییەکەی بۆ بگێڕنەوەو چیتر لەنێو تەعریفە سواو و پواو و نەزۆکەکاندا نابووت و بێمانا نەبن. ئەمەش نابێت ئەگەر دیسانەوە لەناو ئەو شتانەدا چینە بکەین کە تەنها ئایدۆلۆژیاو دین پاوانی کردوون و هێزو وزەیان لەبنەماکانی ئەوانەوە وەرگرتووەو دونیای ئێمەیان پێ رێکخستووەو لێکداوەتەوە. ئەگەر دەخوازی هاوڕێیەتی فیلەوان بکەیت.. دەبێ ماڵێك دروستبکەیت، کە بۆ فیلیش شیاوبێت. بۆیە ناچار دەبێت ماناکان و سروشتی نیشانەکانیان بگۆڕن بەفرە میتۆدییەکی زانستیانەی وەها کە وردبوونەوەو تێڕوانینێکی نوێیان پێببەخشێت کە لەتوانایدا بێت، هەموو پنتە پەراگەندەو نادیدەو جیاوازەکانی کۆمەڵ هاوئاهەنگ و هاوهیوا بچنە پێشەوەو نوێنەرایەتی رۆحی سەردەمیانەی خۆیان بکەن و ئایدۆلۆژیاو ئاینیش لەو ڕۆحە کراوەو پەنگ نەخواردوو و جۆشسەندووەدا بەجۆرێکیتر بەخۆیان بگەنەوەو کۆتایی بەسنوور تەسکییەکانی شیکردنەوەو لێکدانەوە تاك ماناییەکانیان بهێنن و تێبگەیەنرێن، ئێوەش دەتوانن هەر یەك مانا بن.. نەك هەموو ماناکان، یاخود باوکی هەموو ماناکان.

دەبێت بیروباوەڕەکان بەکۆتایی خۆیان بگەیەنرێن و جێ بۆ بیرکردنەوە بەردەوامەکان چۆڵبکەن و بکەنەوە، بەو مانایەی خۆیان وەك



یەکێك لەدەرکەوتەکانی بیرکردنەوە لەقۆناغێکدا ببینن، وا مەزەنە نەکەن خۆیان بەسروشتی دوا بیرکردنەوەکان ببینن و بزانن، چونکە وەستان لەو تەنگژە نائەقڵانییەدا ئەگەری زیاترو دۆزینەوەی زیاتری خۆمان و ژیان و شارستانییەتمان لەبەردەمدا وندەکەن و دەسڕنەوەو فۆتۆکۆپی ئەو دەسەڵاتە دیسپۆتیزمانەمان بۆ دەکەنەوە کە لەڕۆژهەڵاتی ئایین و ئایدۆلۆژیادا مەرگەساتخوڵقێن بوون و دەبن بەهۆی ئەو ئەقڵە دوگماگەراییانەوە. تەنها تێبینییەك بیکەن ئەوەیە کە چۆن دەسەڵاتی سیاسیان لەکیس نەچێت جا کێشە نییە با دونیاو ژیانیش وێران بێت و بسووتێت. بەڵێ کەنعان مەکییە باشی بۆ چووە، کە دەوڵەتی بەعس دوای هەموو شکستێکیش پێیوابوو هەر سەرکەوتووە، چونکە ئەو ئەقڵیەتە داخراو و تاکڕەهەندو تاك مانایە شەڕخوازە سەلامەتی حیزبەکەی خۆی لەسەرو هەموو نەتەوەو بوارەکانی تر دەبینی، چونکە ئەو جۆرە ئەقڵیەتانە نیشتمان و مێژوو و مرۆڤەکان و چارەنووسیان هەر بەخۆیان دەزانن، بەڵام بێ راوێژو پرس بەوان. ئەمانە هیچ بەهایەکی راستەقینە نابینن بۆ بەهاگەلێك کە لەدەرەوەی لۆژیکی سیاسی و ئایدۆلۆژی خۆیاندا هەبن. ئەم نەخۆشیە ئەقڵی و ئەخلاقی و وجودییە پەتایەکەو پێدزکەی کردۆتە ناو ئۆپۆزیسیۆنەکانی جارانی خۆشیەوە، ئەمێستا دەسەڵاتەکانی خۆمان بەرە بەرە جارێك بەئاشکراو زیکزاکی و جارێك پەنامەکی لاسایی دەکەنەوە. هەر لەپەرستنی سەرۆکەکانمانەوە بەپاڵەوانی مێژوویی و هەر لەقبوڵنەکردنی یەکتری و هەر لەدامەزراندنی دەزگاو دامەزراو و سەندیکای کارتۆنی و رامکردن و دەستەمۆکردنی نووسەران و هەر لەبەرزکردنەوەی

جەنگاوەرێکی حیزبی بۆ پلە باڵاکانی ئەفسەری و هەر لەبووژاندنەوەی عەشیرەتگەری و دیوەخانەکان و هەر لەخەمساردیی لەبەرامبەر ئەتککردنی ئافرەتان و جوانییەکانی ترو... تاد.

لەم دۆخە ترسناکەدا کە بەژێر پێستی کۆمەڵدا دەڕوات، کە ئێمە حورمەتمان نەبێت بۆ زیندووەکان، دەشێ چ چاوەڕوانییەکمان هەبێت بۆ یادوەریی مردووەکانی ئەنفال و هەڵەبجەو گەلی بازێ و شێخ وەسانان و سێوسێنان و کوێ و کوێی تر؟ ئەوە نەبێت، دەزگاو دامەزراوە بێشوناسەکان لەڕووی کۆمەڵناسییەوە، کە تەنها ریشەیان دەچێتەوە سەرحیزبیەکانیان و هێرش و گەمارۆدانەکانیان بەداخوازی حیزبەو بۆ راگرتنی هەیبەتی حیزب و وەزیفەکانێتی. ئیتر گرنگ نییە هەر شتێك بەم داخوازی و راگرتنی هەیبەت و وەزیفەیەش ڕێگاکانی خۆی ون بکات. دروشمەکانی حیزب.. ئەرك و هەوڵ و کۆششەکانی حیزب، گومان هەڵنەگرن و فەلسەفەی گونجاون بۆ بەرەوپێشبردنی نەتەوەو دەربازکردنی لەنێو تەنگانەو گۆشەگیرییەکانی خۆیداو رێککردنەوەی نارێکییەکانیشێتی! ئەوەی لاری لەم میراتەی دەسەڵاتەکانی پێشووش هەیەو پێشبینی کەتن و کەوتنێکی ترو گرفت و مەترسی هەناوبڕ دەکات و خوێندنەوەی جیاوازتری هەیە بۆیان، گێرەشێوێنە.. هەرزەکاری سیاسییە.. شاعیرێکی فەنتازی دوور لەواقیعە.. هیچ لەباردا نەبوو و ترسنۆك و دۆڕاوە.. بەدبینە.. بەگوفتارەو بێ رەفتارە.. ئەنتی دەسەڵاتە.. فەوزەوییە.. بەکرێگیراوە.. سەفسەتەکەرە.. تابووری پێنجەمە...تاد.



داخوا نەوەی نوێ بۆ ئەوەی لەنوێیەتی خۆی رازیبێت و بەبنچینەی بکات و بۆ ئەوەی تێکنەشکێتەوە لەنێو وەهمی ئایدۆلۆژییەتە گەوهەر تێکشاوەکاندا دەتوانێ بەقاڵب و کلێشەی تەفسیرە کۆنەکان لەنێو تەونە جاڵجاڵۆکەییەکانی ئەو هەراو زەنایە بەدامەزراوکراوانەی ئایدۆلۆژیا داماوەکاندا رێدەرببباو بەشێوەیەکی تەندروست بەخودە ونبوو و لەدەستچووەکانی خۆی بگاتەوەو کەوتنەکانی تێبپەڕێنێت و بەڕۆحێکی سەرفرازەوە بڵێت: چیتر نە پێویستم بەوەیە بت بم.. نە بت پەرست بم؟

چیتر ئەقڵی من.. دەروونی من.. بوونی من.. ئازادیی من.. مافی من، جێی حەوانەوە نییە بۆ تەوتەمە خۆماڵی و بێگانەکان! لەسەر خاسیەتی مرۆڤبوونی خۆم چ بەشێوەی ئەقلانییانەو چ بەشێوەی رۆحیانە، لەخێزانەکاندا، پەرستگاکاندا، قوتابخانەکاندا، دامەزراوەکاندا، بێدەنگ نابم و بەچاونەترسییەکەوە کە پشت ئەستوورە بەتەوژم گەلێکی فیکری و رۆشنبیریی و کەلتووریی، کە رۆڵێکی بنەڕەتی دەداتەوە بە- من- و کەسایەتییە ئینسانییەکەم و بوێرانە، لەنێو ئەو ئاژاوەگێڕییە سەرنگوومکەرانەی کە نەیانهێشتووە نەوەکانی ئێمە روو لەخۆیان بکەن و بەهەموو بوونیانەوە قوربانیبوون و کەساسانەش روویان لەقاپی و دەستی پڕ رەحمەتی ئایدۆلۆژیاو سیاسەت و ئایین کردووەو خۆیان بەپارێزەری ئەم پرنسیپانە نەزانیووە کە لێیان داماڵڕاوە: (بوێری بیرکردنەوەت هەبێت.. بوێری بۆ خۆت بیت.. بوێری ئینسان بیت- کانت -) هەتا لەوێوە رێنموویی و کۆشش بۆ قەرەبووی رۆحی گونجان و تەبایی بکات. ئەگەر نەوەی نوێ بەمەزنییەکەی لەدەستی بێت، ئەو مەزنییەی ( کە

بڕیار بدات خۆی بێت– کانت–) پوخت.. بەسێگۆشەیەکی دەچوێنم، لوتکەی ئێستاو دوو گۆشەکەی بنکەکەیشی رابردوو و داهاتوو بێت.

بتوانێ هارمۆنیکیەتێکی پڕ لەڕیتم لەنێوان وێنە جیاوازەکانی ئەو سێ پنتەو نێوانەکانیاندا بخولقێنێ و بسازێنێ، ئەوجا بەلێپرسراوەیەتی لەئاست خۆی و ئەویتردا، بەدەروون روونییەوەو لێوردبوونەوەیەکی قوڵی ئێتیکیانە، نەك بەرژەوەندی خوازانە، دەتوانێ حورمەتی زیندووەکان و قوربانییەکانیش بەبەهای خۆیانەوە بگرێت. بەبێئەوەی بانگەشەکەری مەرجەکانی ئیرۆسیەتێك یان تاناتۆسیەتێك بێت و ببێتە جەنگاوەریان، بەڵکو لەدەرەوەیاندا بەوە دەگات هەموو ئەوانە بە( شێوازێك لەشێوازەکانی بوون دەبینێت– ئۆیگین فینك–).

**پرسیار:** ئایا ئەدەبی کوردی بەتەعریفە جیاوازەکانی ئێوەوە بۆ ئەدەب چەند بەرپرسیارە لەبەردەم بیرنەکردنەوەدا لەئەنفال؟

**ئەنوەری رەشی عەوڵا:** ئەنفال کارەساتێکە لەجێگەیەکدا، لەزەمەنێکدا روویداوە، کە – جێگیرو نەگۆڕ–ەکانی ئەو رووداوە بەهەموو نهێنییەکانەوە دەخوازێ زانیاریمان لەبارەیەوە هەبێت و بەدۆکۆمێنت بکرێت، هەتا بەبەڵگەوە بچێتە خانەی مێژوویی خۆی و لەپاڵ تراژیدیا تاقانەکانی تری وەکو هۆلۆکۆست لەلایەن ئایدۆلۆژییەتی نازیستی ئەڵمانییەکانەوەو ئەرمەنییەکان لەلایەن ئایدۆلۆژییەتی مەزهەبیانەی



بارگاویکراو بەنەژادی تورکەوەو بۆسنەو ئەلبانییەکان لەلایەن ئایدۆلۆژییەتی تۆتالیتاری سربیاوەو ئەنفال لەلایەن ئایدۆلۆژیای شۆڤێنی عەرەبی زاخاودراو بەئیسلامەوە. دەچنە خانەی فینۆمینەوە، کە جیهانی دیاردەکانە، کە لەسەر (دەرکەوتن وئاشکرابوون) وەستاوە. واتە ئەو جیهانەی لەبەرچاوماندایەو بەهۆی هەستەکانمانەوە دەیناسین و ئەقڵیش دەتوانێت بیخاتە ژێرپرنسیپەکانی خۆیەوە بەبەڵگەی ئەقڵانی و مەیدانی و زمانی لۆژیکیانەی هزر بسەلمێنرێت.

کەچی رەوشی ئەدەب – ناجێگیرو گۆڕدراوە – بەخوازەو رەمزو هێماو ماناو نیشانەکانیشیەوە، کە دەچێتە خانەی نۆمێنەوە– واتە– ( جیهانی شتێك لەخودی خۆی) کە جیهانێکی ون و شاراوەیە. ئەم دوو چەمکەش لەلایەن ئیمانوێڵ کانتەوە هاتە نێو رێڕەوەکانی بیری نوێوە. داخوا ئەم دوو خەسڵەتە گۆڕدراو و نەگۆڕاوە چۆن بتوانین تێکەڵبکەین و لەیەکدی نزیك بخەینەوە؟ لەکاتێکدا کە ئەنفال سەر بەزەمەنی فیزیکی و ئەدەب سەر بەزەمەنی بێگەرد، یان ئەودیوو زەمەن بێت – برجسۆن –بەو مانایەی ئاراستەیان.. زمانیان.. زەمەنیان.. کەرەستەکانیان.. میتۆدییان...تاد. دەتوانین بەدوو ئاراستەی جیاوازو پێچەوانەییدا گوزەرانیان ببینین؟ دەرهەق بەم دوو ئاراستەیە، نیچە دان بەوەدا دەنێت کە ئەو واقیعەی هۆکارەکانی– زانین– و ناسینی مرۆڤ–هەستەکان– وێنەی دەکێشێت، جیاوازە لەو واقیعە راستەقینەیەی کە هەیە، چونکە لای نیچە جیهانی دیاردەکان ئەو جیهانەیە کە ئەقڵ دەتوانێت بیخاتە ژێر پرنسیپەکانی خۆیەوە، ئەو جیهانەیە کە بەهۆی هەستەکانەوە دەرکی

پێدەکەین، بەڵام (جیهانی ڕاستەقینە) لای نیچە ئەو جیهانەیە کە هەمیشە لەگۆڕان و وەرچەرخاندایەو (هۆکارەکانی زانینی مرۆڤ) ناتوانن بیناسن. لێرەوە ئەنفال بەو دیوەی کە ڕوداوە نیوەی سەر بەفینۆمینەو ئەمەش دەخوازێ کە لەڕووی زانستە مرۆڤایەتییەکانەوە، بناسرێ و ناولێبنرێت و شیبکرێتەوەو بەدۆکۆمێنت بکرێت.

نیوەکەی دیشی کە گۆڕاو و ناجێگیرە، لەنێو خۆیدایەو شاراوەیەو ونە، کە بەڕای نیچە ئەمە (جیهانە راستەقینەکەیە) ئاشکراکردن و دۆزینەوەو دواندنی ئەو جیهانەش ئیستاتیکیانەیەو خەیاڵی داهێنەرانە لەوێدان و بەها ونبووەکانی مرۆڤبوون کە، مێژوو زانستەکان بەسەریدا تێپەڕیوون و نەیانبینیوە. ئەم (ئیستاتیکا) دەیخاتەوە سەر ڕەوتە بەردەوامە – صیروره – ناچۆڕاڵیەکەی خۆی.

ئێمە لەتان و پۆی هەردوو بوارەکەدا هەژارین و پەلەقاژێمانە. وەکو ئاماژەمان پێکرد هەموو کایە مەعریفیەکانمان ڕەتکردۆتەوەو تەلاقداوە یا راستر شاربەدەر کردووەو کورتکردۆتەوە بۆ کۆمەڵێ وەزیفەی ناوئاخن پوچ و ترسێنەری سیاسی و ئایدۆلۆژی و بەوەفاو گوێبیستی پەندو وەعزە سەرخۆشکەرو فەرمانە چۆکپێدادەرو پەیمانە دەستخەڕۆکەرو لەبیرکەرەکانی ئەوان بووین. ئەمەش ئەوە دەگەێنێت ڕێگاکانی بوونمان ونکردووەو بەم کاڵفامیەمان نکوڵیمان لەبوونی راستەقینەی خۆمان کردووە، چونکە بەکایە مەعریفیەکانی تر خۆمان نەدۆزیوەتەوەو نەپشکنیوەو نهێنییەکانمان هەڵنەکۆڵیووەو ڕێگای تازەمان کەشف نەکردووەو مانای سەردەمیانەمان دانەڕشتۆتەوەو برەوپێنەداوەو لەجێی



مانا سواوە مەزهەبی و ئایدۆلۆژی و فەرهەنگی کۆلۆنیالیستانەی دەرو دراوسێکانماندا. دەربارەی نەخشەو پێگەی بوونی خۆمان لەنێو ڕووناکی و سێبەری کەلتوورە جیاوازەکانی مرۆڤایەتیدا سەرنگووم و گومناو و نەبینراو بووین. هەر ئەمەش بووەتە مایەی ئەوەی هەمیشە لاڵ و زارەترەکبین لەگێڕانەوەی تراژیدیا تاڵەکانی خۆمان و لەدەستمان نەهاتووە ڕەمزو هێماو ماناگەلێکی لێ هەڵبهێنجین کە لەفەرهەنگی نەوەکانی داهاتوواو جیهانیدا مانادار بن و ببنە ژێدەرو سەرچاوەگەلێك بۆ هەموو ئەو ئەو بوارانەی گەرەکیانە بەگوتراوەکانمان بماننناسن و ناوزەدمان بکەن و ئێمەش رازی بکات و بڵێین: بەڵێ ئەوە ئێمەی نرخێنراوین بەپێودانگی خودێکی هوشیارو مرۆڤێکی ئازادو کۆمەڵگایەکی کراوەو مێژوویەك، کە ئاوسە بە( ئیرادەیەك.. کە بەووزە رۆحیەکەی هەمیشە پارێزگاری ژیان دەکات و ژیان بڵاودەکاتەوە– شۆبنهاوەر–).

**پرسیار:** ئایا ئاستی ئەو ترسە شاراوەیەی لای ئینسانی کورد هەیە بەرامبەر کوردبوونی خۆی، ترسێکە خاوەنی هێزێکی رۆشنبیری وایە کە بتوانێت لەبری تۆڵە خۆبکات بەهێزێك کە هەڵگری لێبووردن بێت. ئایا ئەم هێزە چەند دەستەڵاتی کوردی لێی بەرپرسیارەو چەندیش کۆمەڵگەی کوردی و رۆشنبیرەکانی بەرپرسیارن لەپیشاندانی؟

**ئەنوەری رەشی عەولا :** دەتوانین هەر ئێستا لەو پرسیارانەی بەڕێزتان، کە ڕووبەڕووی کۆمەڵێ نووسەرتان کردووەتەوە بەجیاوازی

دنیابینی و سروشت و میتۆدی کارکردنیانەوە و بە( پێنوسی جیدی) دەربارەی پرسی ئەنفال ناویاندەبەیت، بەدەروازیەك لەنەریتی لێبووردەیی بەگەڕبخەین و چاولێبکەین و تێبگەین و بڵێین: کۆڕامانێك بێئەوەی، هیچ ڕامان و لێکدانەوەیەك بەدوا ئەنجام و تەفسیر دابنێین. تەنها ئامانج لەو خوێندنەوەو هەڵسەنگاندنە جیاوازانە نیشاندانی هەمەڕەنگی ئەندێشەو لێکدانەوە جیاوازەکانە. بۆ نمایش و خستنەڕووی رەهەندگەلێك لەنێوان ( پێنوسە حیزبیەکان) و ( پێنووسە جیدییەکان) دەخرێتە بەرچاو. هەتا لەلایەن گروپی سێیەمەوە تاووتوێ بکرێن و فۆرمێکی تازەی لێهەڵبهێنجرێت. ئا لێرەدایە بۆچوونەکەی جون میل سیتوارت میل دەمانگرێتەوە کە دەرهەق میکانیزمی لێبوردەیی رای وایە ( دوو باوەڕی دژ بەیەك، هەریەکەو بەجیا بەشێك لەهەقیقەتی پێیە" لەم حاڵەتەدا– باوەڕی سێیەم – بێتە ئاراوە.. کە وێڕای جیاوازیشی لەتەك هەریەك لەباوەڕە دژ بەیەکەکاندا، لەهەقیقەتی هەردوولایان بەهرەمەند بێت و کۆی ئەو هەقیقەتانەش لە– فۆرمی ئەندێشەیەکی تازەدا– لەخزمەت کۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا دابنێت)، چونکە گەوهەر و کرۆکی لێبووردن ئەگەر لەسەر هیچ هاوپەیمانییەتێکی ئەخلاقی، فیکری، رۆشنبیری و ئینسانیانەدا خۆی شێوەباز نەکردبێ، ئەوە لێبوردەیی نییە، بەڵکو خۆبەکەمزانینی دەروون گرگنی کۆیلەیەکە، یان خودمەزنی ستەمکارێکە کە بەنەیارو جەللادەکەی دەڵێت: بمفلیقێنەوە، خۆ منی ماسۆشیست لەدواجاردا لەتۆی سادیست دەبوورم، یان بەپێچەوانەوە ! ! هەروەها میل لەسایەی ئەو لێبوردەییەدایە رووبەڕووی ئامانجێکمان دەکاتەوە کە ئەمەیە: (



لەبەرامبەر باوەڕە نەیارەکاندا زەمینە بۆ خستنەڕووی باوەڕە جیاوازەکان خۆشدەبێ و بەمجۆرە شێمانەی– گرێدانەوەی بەشەکانی هەقیقەت– کە لەنێوان رەقیبە فیکرییەکاندا دابەش بووە، دێتە ئاراوە). ئەمە ئەو هێزەیە کە رۆشنبیران کاری بۆ دەکەن و لەپاراستنی– پرنسیپەکانی هاتنەکایەی ئەو هێزەدایە– بەشێوەیەك لەشێوەکان لێپرساوێتیان دەکەوێتە ئەستۆ! لایەنی کەم بەشێوەیەکی پراکتیکی و بەرجەستە پیشانی خۆیشی دەداتەوەو دەسەلمێنێ: یەك هەقیقەت بوونی نییەو نابێ. ئەوەی هەڵگری سامانی هەقیقەتێکی جودا لەتۆ بوو نەیار نییە، بەڵکو تەنها لەتۆ جیایە!

ئەم نەریتە بۆ ئەوەی دادپەروەرانە لەنێو هەموو بوارو ئاستە جیاوازەکانی کۆمەڵگادا وەکو یەك خۆی نمایش بکات و بەڕێوە بچێت و هیچ گروپێك هەست بەپێشێلکردنی مافی خۆی نەکات و بەبنەماکانی هەمان پێودانگیش بەدەسەڵاتەکانی تر بێژین: بەڕێزینە، ئاییینامە حیزبیەکەی ئێوەش گوزارشت لەدەنگ و رەنگ و بۆی گشت مەیلە جیاوازەکان ناکات و– رۆحی باڵای نەتەوە– بۆ ئەوەی لەنێو مەنگەنەکانی ئایدۆلۆژیا تۆتالیتاریەتەکەی ئێوەدا مەحف نەبێتەوەو پێبگات.. دەشێ بوار بۆ رادەربڕینی راو بۆچوونە جیاوازەکانیشی نێو هەناوی کۆمەڵگا بهێڵێنەوەو ئەوەی لەدەسەڵاتدا بۆ ئێوە رەوایە، دەشێ هەموو گروپەکانی دەرەوەی تۆش هەمان ئامراز بۆیان رەواو فەراهەمبێت. روونتر پێیان بگوترێ، چیتر نابێت هەموو دەسەڵاتەکان لەلایەن کەسێکەوە یان گروپێکەوە قۆرخ بکرێت، بەڵکو دەبێت دەسەڵاتەکان

دابەشبکرێن. هـەتاوەکو ( مافـە سروشـتیەکانی تاکـە کـەس و – گـروپ– سەبارەت بەژیان و ئازادیی و موڵکدارێتی پێشێل نەکرێت– جـۆن لـۆك–)، بۆئەوەی ئەم بنچینەیەش سەقامگیربێت و ساختە نـەبێت وەکـو دروشمـە پوچـکراو و بێناوەڕۆکـەکانی ترتـان دەبـێ ( هەرسـێ دەسـەڵاتەکە– جێبـەجێکردن و دادوەری و یاسـادانان– لەیـەکتر جوداکرابێتنـەوەو چـاودێری یـەکتر بکـەن، ئەمـەش دەبێتـە مایـەی بـەهێزکردنی یـەکتری و لەگەڵ دەسەڵاتەکانی تر هاوسـەنگی دەکاتـەوە– مۆنتسـکیۆ–)، ئەمـەش ئەو ئەرکەیە کە دەکەوێتە سەر دەسەڵاتی کوردی.

بـۆ ئـەم ئەرکـە ئینسـانگەرایەش، دەبـێ هەمیشـە لـەڕووی فیکـری و ئەخلاقیەوە، سروشتی ئـەو ئاسـتەنگانە بناسـین و تێبگـەین.. کـە دەبنـە هۆی سنووردارکردن و ئیفلیجکردنی بەرهەمهێنانی پرسی لێبوردەیی.

بـەدیوێکی تریشـدا نـەبووەو نـاکرێ پاسـەوان و پارێزگـاری ئـارامی و ئاسایشـی نـاو کۆمەڵگاکـەی خـۆت نـەبیت، لەلەگـەڵ دەرەوەی خۆتـدا بێگرفت و ئارام بچیتە پێشەوە. ئەوەی ئارام نەبێت لەگـەڵ خۆیـدا، چـۆن دەتوانێ ئارامی ببەخشێت بەدەرەوەی خۆی؟

دەشێ رۆشنبیران لـەو دۆخ و رەوشـانەدا، نادیـدە نـەبن و لەسـەرپێ و دەستپێشخەر بن بۆ رەخنەو لێتوێژینـەوەو بەتوانسـتەکانیان.. خـەڵکی و دەسەڵات و دام و دەزگاکانیان هۆشیاربکاتەوە لـەو مەترسـییانەی سـەری خۆیان و ئەزمونەکەشمان دەخوات!

# خالد سلێمان



# ئەنفال، دانپێدانان، لێبوردن

**ئەنفال تراژیدیایەکە پێویستی بەدووبارەکردنەوەی بە" هەواڵ" هەیە. دەبێت ئێمە توانای دروستکردنی هەواڵێکی نوێمان لەسەر هەموو ئاستەکانی کارەساتی ئەنفال هەبێت. هەواڵێك رووداوەکە بگەڕێنێتەوە بۆ بەرچاوی دونیا. ئایا ئەمە دەکرێ و کەی، ئێ، چۆن؟**

خالد سلێمان



**پرسیار:** ئەگەر بهاتایە ئەنفال لەوڵاتێکی ئیسلامیدا روویندایەو هەروەها مانایەکی ئیسلامیشی پێندرایە، پێتانوایە ئەنفال بتوانرایە نوقمی بێدەنگیەکی وابکرێت، هەم لەلایەن وڵاتانی دراوسێوە تا دەگاتە هەموو وڵاتە ئیسلامییەکانی دنیا، ئەوسا وڵاتانی ئەوروپی؟

**خالد سلیمان:** بێدەنگی لەسەر ئەنفال، بێدەنگبوون نییە بەقەدەر ئەوەی دانپێدانەنانە بەسروشتی پرۆسەی ئەنفال وەك خۆی، واتە وەك " جینۆساید". بەڕای من هەموو بێدەنگییەك لەسەر ئەنفال لەم خاڵەوە دەستپێدەکات و هەر لەم خاڵەشدا کۆتاییدێت. لەهۆش و نەستی نوخبەی کەلتوری و سیاسی کوردیدا دەتوانرێت بەئاسانی هۆکاری یەکەمی ئەم بێدەنگییە یان ئەم دانپێدانەنانە بەوە دابنرێت کە ئەنفال لەوڵاتێکی ئیسلامیداو بەمانای عەرەبی– ئیسلامی ئەنجامدرا، بەڵام ئایا ئەمە راستە، یان چەند راستی هەڵدەگرێت، تا چ رادەیەك لەتاکڕەهەندیی دوورمان دەخاتەوەو لەهۆکارەکانی تری هەمان ئەو دانپێدانەنانە نزیکمان دەخاتەوە.

پێش هەموو شتێك، پرسیاری لەم شێوەیە رادەیەکی زۆر لەفرەڕەهەندی وەردەگرێت و مەسەلەکەش (بە رای من) تەنها لەم ئاستەدا کۆنابێتەوە، چونکە کارەساتی ئەنفال و بێدەنگی لەبەرامبەریدا تەنها لەڕوانگەی ئاستی جیۆپۆلۆتیکی و ئایینییەوە، ئاستە نێودەڵەتییەکەیمان لەبیردەباتەوە.

باشتروایە هەر "ئەگەر" ێك لەباسكردن لەسەر ئەنفال دوور بخەینەوەو سەرچاوەو هۆكارەكانی بخەینە ناو كاری تیۆری كوردییەوە لەسەر پرۆسەكەو سەراپای سەرهەڵدان و دەستپێكردن و ئەنجامدانییەوەو هەروەها ئاكارەكانیشی. بەشێوەیەكی تر لەمیانەی ئەم بیرۆكەیەدا دەمەوێت بڵێم : بۆ ئەوەی قەبارەی كارەساتەكە نەچێتە خانەی رووداوێكی ئاساییەوەو لەبێدەنگیدا نەپێچێنرێتەوە، پێویستمان بەزیندوكردنەوەی وردەكارییەكانی هەیە، واتە بەڵگەنامەو شایەتحاڵ و وێنەو كەلوپەل و هەرشتێك پەیوەندی بەڕووداوەكەوە هەیە. هەڵبەتە لێرەدا زۆر ئاسانە بڵێین ئەگەر ئەنفال لەوڵاتێكی ئیسلامیدا رووی نەدایە ئەوا هەر لەكاتی روودانییەوە بە"جینۆساید" دەناسرا، ئەمەش مانایەكی زۆر لەڕاستی هەڵدەگرێت، لەهەموو كاتێكیشدا ئەگەر رەهەندی جیۆپۆلۆتیكی كوردستان خۆیمان خستە پێش ئەم مانایە.

ئەگەر بەم ئاسانكارییە بێت وڵامی هەر پرسیارێك لێرەدا كۆتایی پێدێت، بەڵام ئایا ئەگەرێكی وەها لەبەردەم واقیع و قەبارەی كارەساتەكەدا بەكوێمان دەگەیەنێت، یان بەشێوەیەكی تر دەشێت ئەو ئەگەرە لەدۆخە مێژووییەكەی دابپچڕێت و بخرێتە پێشمانەوە، یان بۆ خۆی ئەگەرێكە لەپێشمانەوەیەو هێشتا نەكەوتووەتە دواوە؟ لێرەدا پرسیارێكی نوسەر و رووناكبیر "مەریوان قانع"م بیردێتەوە كە دەڵێت: (داخۆ ئەنفال رووداوێكە سەر بەمێژووەو كۆتاییپێهاتووە، یاخود رووداوێكە دەكرێت سەر بەئاییندە بێت و رووبداتەوە، شتێكە بەسەرچووە



یاخود تائێستاش ئەگەرێكەو تێنەپەڕیوە، كارەساتێكە لەدوامانەوەیە یاخود مەترسییەكەو هێشتا لەپێشمانەوەیە؟).

لێرەدا ناڵێم بێدەنگبوون، بەڵكو ئەگەری روودانەوەی ئەنفال لای كورد (لەدۆخە دروونییەكەیدا بەلانی كەمەوە)، پرسیاری " شوێنی ئیسلامی"، تاكە رەهەند نییە لەگەڵاڵەكردنی هەر دیدێكدا بەرامبەر بەكارەساتەكە، بەڵكو لەهەناویدا، پرسیاری " شوێنی قەومی " كوردو ئیسلامبوونی بەشێكی تری هاوكێشەی هەر بۆچوون و تێخوێندنەوەیەكە رۆشنبیریی كورد بەرهەمی بێنێت.

لەمیانەی ئەم فیكرەیەدا پەراوێزێكی بچووك هەیە، ئەویش پاشەكشەكردنی رۆڵ و ناسنامەی ئیسلامییە لەدیاریكردنی سروشت و كاردانەوەی كارەساتەكەیە لەناوچەكەو جیهاندا. هەر لەپاڵ ئەمەشدا " سونە" بوونی كورد وەك فاكتەرێكی مەززەبی هیچ رۆڵێكی نەبوو، چونكە زۆر بەئاسانی، ئەنفال نمایشێكی قەومییانە بوو پێش هەر ئاستێكی تری بیركردنەوە.

ئەم تێڕوانینە پێویستی بەدۆخێكی جیۆپۆلۆتیكیی هەیە دەتوانرێت ناوی لێبنرێت " دۆخی پۆست كۆلۆنیالیزم "، واتە ئەو سنوورە كەمەی وا لەدوای رێككەوتننامەی " لۆزان " ەوە بۆ كورد وەك نەتەوەیەك دانراو. هەر ئەم دۆخەش نەتەوەكانی تری پێ دەمارگیرتر كراو گەیاندییە ئاستێكی ترسناكی وەها، خەیاڵی قەومی تیایدا نوقمی كەلتووری ئەوە بێت كە كورد كانەخەڵووزێكی ترسە!

لەدرێژەی هەمان روانگەدا، دەتوانم بڵێم ئەگەر ئەنفال دژی نەتەوەیەکی تری جیا لەکوردو جیا لەئیسلام بوایە، ئەوا بەلانی کەمەوە " رۆژئاوا" هەر بێدەنگییەکی دەشکاندو چوارچێوەیەکی بۆ مامەڵەکردن لەگەڵیدا دادەنا. ئەگەرێش ئەو دۆخە پۆست کۆلۆنیالییەی کوردی تیا ئەنفالکرا بەشێك نەبوایە لەکەلتووری کۆلۆنیالیزم ئەوا ئیمکانی بێدەنگیی کەمتر دەبوو. هیچ یەکێك لەو دوو دۆخە لەبەرژەوەندی کورددا نەبوو، لەئاکامیشدا دانپێدانان بەئەنفالدا وەك جینۆساید لەسیاسەت و بۆچوونی رۆژاواییدا تا ئێستا نەبووەتە پرۆژەیەك.

بەشێکی زۆر لەناوەندە ئەمریکییەکان باس لەوە دەکەن ئەگەر بەڵگەنامەیەکی رەسمی هەبێت و تیایدا بەرپرسە عێراقییەکانی حوکمی سەددام حسێن داوای لەناوبردنی کوردی تیا دەکەن. لێرەدا وامان بۆ دەردەکەوێت کە ئەو ناوەندانەو زۆری تریش لەئەورووپا، بەئاشکرا ئەنفال لەباری "بێدەنگی" دا پێناسەدەکەن، ناوی لێنانێن و لەخەسڵەتە واقیعییەکانی خۆیەوە تەماشای ناکەن، چونکە ناساندنی ئەنفال وەك جینۆساید، واتە نوێکردنەوەی پرسیاری کورد لەدۆخی پێش کۆلۆنیالیزمەوە، کە تیایدا ناسنامەی میللەتێك لەرووی جیۆپۆلۆتیکی و کەلتووری و کۆمەڵایەتییەوە خرایە هەناوی پرۆژە قەومییەکانی ترەوە.

بەشیکی تری ئەو بێدەنگییە ئەوە بوو کە ئەنفال خۆی لەبێدەنگیدا ئەنجامدرا. بەڵام بێدەنگییەکی دروستکراو، کە گرنگی گەلی کورد تیایدا بەشێك بوو لەبەرژەوەندییەکانی رۆژاوا لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا. ئەمەش بەهیچ شێوەیەك ئەوە ناگەیەنێت کە پلانی لەناوبردنی کوردو هێرشی



سوپای عێراق بۆسەر گوندو ناوچە جیاجیاکانی کوردستان لەلای حکومەتە رۆژاواییەکان ئاشکرا نەبوبێت، بەپێچەوانەوە، هەر سەرەتای دەستپێکرنی گفتوگۆکانی " عێراق – ئێران " بەکۆتاییهێنان بەشەڕە هەشت ساڵییەکەیان بەشێوەیەکی جیدی لەساڵی 1988، ئیدارەی ئەمریکی بەتایبەت ئاگای لەپیلانەکانی عێراق بوو. بەشێك لەسەرکردایەتی کورد لەوە ئاگادارن و هەر لەو ساڵەدا سیناتۆرێکی ئەمریکی بە"مام جەلال " سکرتێری گشتیی یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستانی وتبوو کە رژێمی سەددام حسێن پیلانێکی گەورەی بۆ لێدانی کوردستان لەبەردەستدایە. هەروەها پێیوتبوو کە هەمان رژێم داوای گفتوگۆ لەسەرانی کورد دەکات. بەڵام ئەو زانیارییانە لای سەرکردایەتی کورد بەجیدی وەرنەگیراو لەدواییدا دەرکەوت راستبوون.

لێرەدا بەراوردێکی بچووك لەنێوان ئەنفال و جینۆسایدی " هوتو" ەکانی وڵاتی رواندا دژی " توتسی " یەکان جێگای وەبیرهێنانەوەیە، کە ئەمانی دووەمیان بەپێی شایەتییەکانی کۆماندانی کەنەدی " رۆمیۆ دالێر " سەرکردەی هێزەکانی نەتەوەیەکگرتووەکان لەو وڵاتەدا ساڵی 1995، جینۆسایدێك بوو بیرۆکراسیەتی نێودەڵەتی و نەتەوەیەکگرتووەکان خۆی بووە هۆی ئەو هەموو کوشت و بڕینە کە نزیکەی ملیۆنێك مرۆڤی تیا کوژرا، بەڵام ئەوەی لەکوردستاندا روویدا بێدەنگییەکی لەڕادەبەدەرو ترسناك بوو، هەر لەبەر ئەم هۆیەش " پۆست هێڵتەرمان " رۆژاوا بەهاوبەش لەو تاوانەدا ناودەبات.

ئەوەی پەیوەستە بەڕووەکانی تری ئەنفال لەناچەکەداو باری کورد تیایدا، وەك لەپێشدا ئاماژەم بۆ کرد ئیسلامبوونی شوێن و مەوقیعی ئیسلامیی ئەو وڵاتانە نەبوو ئەم بێدەنگییەی دروستکرد، بەقەدەر ئەوەی دەمارگیری قەومی چوارچێوەو کاراکتەری سەرەکی کارەساتەکە بوو. ئەگەر ئەوەی روویدا دژی عەرەبە سوننەکان یان دژی تورکمانەکان بوایە ئەوا تورکیاو سعودییە دوو دەرگای سەرەکی دەبوون لەشکاندنی دۆخی بێدەنگی و هاتنە دەنگ لەناوەندە نێودەڵەتییەکاندا. دیارە کوشتوبڕی دیاری شیعەکان لەباشوری عێراق لەکاتێکدا بوو (1991) ئیتر نە ناوچەکەو نە جیهانیش لەبەردەم ماشێنی " قەتڵ و عام " ی سەددام حسێن و حزبەکەیدا توانای بێدەنگییان نەما. لەگەڵ ئەوەشدا دەوڵەتە عەرەبە سوننەکان دان بەو تاوانانەی باشوری عیراقدا نانێن و تەنها ئێران خۆی بەخاوەنیان دەزانێت، بێگومان لەمەشیاندا کەلتوورێکی مەززەبی یان با بڵێین " قەومی ئێرانی " پێوەری شتەکانەو چوارچێوەی ماشێنی راگەیاندنە.

لەپاڵ ئەو هۆکارانەی سەرەوەدا، گەلێك هۆکاری تر هەن پەیوەنییان بەکورد خۆییەوە هەیە. یەکێك لەوانە ئەنفال تا ئێستا نەبووەتە تراژیدیایەکی نەتەوەیی و لەدۆخێکی زارەکیدا ماوەتەوە. با لەوەوە دەستپێبکەین چی هۆشیارییەکی سادەیە ئەنفال لەهۆشیارییەکی کەلتووری دووردەخاتەوە، چۆن دەنگی کورد لەباسکردنی ئەنفالدا بەرز بێت، بەرپرسیارێتی کۆمەڵگاو دەسەڵاتی کوردی لەکوێی تراژیدیاکەدان ؟



**پرسیار:** ئەو هۆکارانە چین کە ئەنفال لەهۆشیارییەکی سیاسی سادەوە کە تەنها لەیادکردنەوەی سەرپێیانەی ساڵانەدا قەتیسبووە، دەگوازێتەوە بۆ هۆشیارییەکی کەلتووری، لەو بێدەنگییەی کە خاوەنی قسە نییە دەگوازێتەوە بۆ بیرکردنەوەیەك بەدەنگی بەرز. هەروەها ئەم بێدەنگییە چەند پەیوەندی بەکورد خۆیەوە هەیە، هەم لەئاستی بەرپرسیارییەتی کۆمەڵگای کوردی بۆ ئەنفال و هەم لەئاستی دەسەڵاتی کوردی خۆیدا؟

**خالد سلێمان:** لەوانەیە لەم بارەیاندا لەپرسیار دەرنەچین و نەگەینە بارێکی وەها توانای قسەکردنمان لەسەر ئەنفال هەبێت. قسەکردنیش بەو جۆرەی دەمانەوێت و رێگەمان بۆ خۆشدەکات لەبری باسکردن لەبێدەنگیی لەسەر ئەنفال باس لەتیۆریزەکردن و رەهەندە مێژووییەکانی بکەین، چیرۆکی ورد بنادبنێین. Oraleو شاراوەکانی، هەروەها شایەتحاڵەکان بێنینە قسەکردن و مێژوویەکی زارەکی.

ئایا تائێستا سەنتەرێکمان بۆ بەڵگەنامەکانی ئەنفال هەیە، کەلوپەل و شتە بەجێماوەکانمان پاراستوە، شایەتیی رزگاربووەکانی نوگرەسەلمانمان تۆمارکردووە، وێنەیانمان لا هەیە، مۆزەخانەیەکمان هەیە؟ ئایا ئەنفال خراوەتە بەرنامەکانی خوێندن و پەروەردەوە، مۆنۆمێنتێکی شایستە بەکارەساتەکە هەیە؟ ئایا شوێنێك کراوەتە رەمز بۆ ئەنفال و " ئۆشڤێتز " ێکی کوردیمان هەیە؟

لەوڵامی ئەم پرسیارانەدا، لەوانەیە بەشێوەیەکی سەرەکی دەسەڵاتی کوردی و رۆشنبیران بتوانن شتێك بڵێن، چونکە کۆمەڵگای کوردی تائێستا خاوەنی دەزگای مەدەنیی و ئابووریی و کەلتوریی سەربەخۆی وەها نییە بتوانێت لەرێگەیانەوە یادەوەری خۆی بەزیندوویی رابگرێت. بەتایبەتی کۆمەڵگا ئەنفالکراوەکە کە لە" بێ نەوا " زیاتر لەهێچی تر ناچێت.

من لەسەرەتای ئیشکردنمەوە لەسەر ئەنفال باوەڕم بەوە هەبووە کە بەبێ ئەو کەرەستەو پێداویستیانەی پرسیاریان لەسەر دەکەم ناتوانین لەو بێدەنگییەی باسی لێوە دەکەین رزگار بین. ئەمەش وا ناگەیەنێت کە لەبواری دۆکیومێنت کردندا هیچ نەکراوەو مادەیەکی خامی باش لەبەردەستدایە کە زیاتر هەوڵی تاکەکەسی کۆیکردوونەتەوە، هەروەها ئەو هەوڵە تیۆرییانەی وا لەسەر ئەنفال کراون. من لێرەدا باس لەکارێکی گەورەتر دەکەم، کارێك بتوانێت سەرنجی چاودێرە جیهانییەکان لەسەر جینۆساید راکێشێت، نەك یادکردنەوە سەرپێییەکان کە لەئاستێکی ناوخۆیی تەسکدا دەکرێت و لەهونەری زیندووکردنەوەوە دوورە.

لێرەدا مافی ئەوە بەخۆم دەدەم باسی پرۆژەیەك بکەم کە ساڵی 2006 خستمە بەردەم ناوەندە کەلتوریی و سیاسیی و جامیعییەکانی کوردستان و لەرۆژنامەی " ئاسۆ " دا بڵاوکرایەوە. پرۆژەکەش تایبەت بوو بەیادی بیست ساڵەی ئەنفال لەسەر ئاستێکی جیهانی، بەشێکی زۆریش لەوانەی لەم بوارەدا کاردەکەن ئاگایان لەو پرۆژەیەیە، بەڵام لەپشتگوێخستن زیاتر هێچی ترم نەبینی.



ئێمە تائێستا زمانێکی وامان نەدۆزیوەتەوە شایستەی ئەوەبێت ئەنفالی پێ تاووتوێ بکەین، مەبەستیش لێرەدا تەنیا زمانی قسەکردن نییە، بەڵکو زمانی لێوردبوونەوە لەشتەبچووکەکانی ئەنفال، بەسەرهاتەکانی، چیرۆکەکانی، چۆنێتی پیادەکرنی، زیندووڕاگرتنی. هەموو ئەمانەش تەنیا لەرێگای کتێب و کاری تیۆرییەوە نابێت، شتی تر هەن کە رۆڵیان کەمتر نییە لەکاری نووسین و لێکۆڵینەوە، ئەوانەش وەك مۆزەخانەیەکی تایبەت بەئەنفال لەسەر ئاستی کوردستان، هەروەها دیاریکردنی ئەو شوێنانەی کە پرۆسەکە تیایاندا گەیشتە ترۆپك، یان ئەو قەڵاو شوێنە سەربازییانەی خەڵکیان تیا کۆکرایەوەو خاڵی ئامادەکردن بۆ شوێنە نادیارەکان. لەلایەکی ترەوە تائێستا سەنتەرێکی نیشتمانیی بۆ بەڵگەنامەکانی ئەنفال نییە، کەس نازانێت چەند بەڵگەنامە لەبەردەستدایەو جۆریان چییەو بەکەڵکی چی لایەنێکی باسکردن لەئەنفال دێن. هەر لەم سیاقەدا دەمەوێت باسی شتێکی تر بکەم کە پەیوەندییەکی راستەوخۆی بەبەشداریکرنی ئیدارەی کوردی خۆییەوە هەیە لەسڕینەوەی بەشێك لەیادەوەرییەکانی ئەنفال، لەوانە سڕینەوەی ناوی ئۆردوگای زۆرەملێی " سمود" بۆ "رزگاری". ئەمە هەڵوێستەیەکی زۆری دەوێت و لەبنەڕەتیشدا ئەوە دەگەیەنێت کە هۆشیاری کەلتوریی و سیاسیی کوردی لەجۆش و خرۆشی شۆرشگێڕیی نەبووەتەوەو پێی نەناوەتە ناو پرانسیپە سەرەتاییەکانی کارکردن لەسەر یادەوەریی و گرنگی ئاکارە دیارەکانی " بەعس" لەکوردستاندا.

دووای چەند ساڵێکی تر ناوی " سمود" لەبیر دەچێتەوەو "رزگاری" بەتەواوەتی لەیادەوەری خەڵکدا دەچەسپێت، لێرەدا ناوێکمان لەناوەکانی ئەنفال لەدەست دا، یان بابڵێین بەدەستی خۆمان سڕیمانەوە. دووریش نییە دووای چەرخێکی تر دەستکەین بەگەڕانەوە بەناوە راستییەکەداو پێداویستییەکانی کاری یادەوەریی و مێژوو ئەو جۆش و خرۆشە شۆڕشگێڕییەی کە ناوەکەی تیادا سڕایەوە، بمانخاتە ناو تونێلێکی بێ رووناکییەوە. لەسەر حکومەت و پارتە سیاسییەکان و بەپرسانی ئەو ئۆردوگایە پێویست بوو بەخەتێکی گەورە ناوی سمودیان بنەخشانایە نەك لەحاڵەتە مێژووییەکەی بیکەنە دەرەوە، چونکە زیندووراگرتنی ئاکارەکانی ئەنفال کە ئینسان و شوێن و یادەوەریی و هەموو پانتاییەکانی تری ژیانی گرتەوە، بەزیندووهێشتنەوەی کەرەستەکانی پرۆسەی ئەنفال خۆیەوە، بەندە. " سمود " یان هەر ئۆردوگایەکی تر بۆی هەیە لەداهاتوودا ببێتە مۆزەخانەیەکی روون و بەرچاو، بەپێچەوانەشەوە ئەو ناو گۆڕینەی دەبێتە کارێکی دژ بەمێژووی کارەساتەکە.

**پرسیار:** ئەو پێشنیازە تایبەتیانەی ئێوە چین. بۆ ئەوەی ئەنفال وەك کارەساتێکی سیاسیی مێژوویی لەیادەوەریی ئینسانی کورددا بەچەشنێك بمێنێتەوە کە هەمیشە جێی ئاوڕدانەوەو قسەکردن بێت لەسەری، لەلایەن ئەو نەوانەی کە لەدوارۆژی کۆمەڵگای ئێمەدان؟



**خالد سلیمان:** یەکێك لەو بنەما سەرەکییانەی لەجیهاندا بۆ لەبیرنەچوونەوەی کارەساتە مرۆییەکان پیادەدەکرێت " زیندووکردنەوەی یادەوەری"یە، ئەویش لەرێگای یادکردنەوەو دانانی مۆنۆمێنت و مۆزەخانەو تۆمارکردنی هەرشتێکی پەیوەست بەکارەساتەکە، وەك وێنەو دەستنووس و کەرەستەکانی ژیانی رۆژانەی قوربانیی و بکوژو ستەمکار بەیەك ئاست. هەر لەم سیاقەشدا، ئەدەب و هونەرو کەلتور، تیایاندا کارەساتی ئەنفال وەك ئیکۆنێکی خەمبارێن لەیادەوەری کۆمەڵگای کوردیدا، جەوهەری هەر باسێکن لەسەر زیندوو راگرتنی ئاکارەکانی ئەنفال و جارێکی تریش دەگەڕێمەوە سەر مەسەلەی ناوگۆڕینی ئۆردوگا زۆرەملێکان، کە نموونەیان دووبارە نابێتەوە. زۆربەی زۆری ئەو نووسەرانەی لەسەر "هۆلۆکۆست" یان نووسی پێیانوایە ئۆردوگا زۆرەملێکانی سەر دەستی نازییەکان و ستالینییەکان دیارترین رووخساری سەدەی بیستەم بوون، هەر لەم روانگەیەشەوە باسێکی زۆر لەسەریان کراو زۆربەی ئەو شوێنانەی تیایاندا تاوان ئەنجام دران، بوونە شوێنی مێژوویی و ساڵانە هەزاران کەس لەیادکردنەوەی هۆلۆکۆستدا روویان تێدەکەن.

ئایا لابردنی ناوی ئۆردوگایەکی زۆرە ملێ لابردنی ترس بوو، یان جۆرێك بوو لەخۆبینین بەسەر مێژووداو نەشئەی سەرکەوتنێکی بچووك بوو، تیایدا دەسەڵاتی لۆکاڵیی کوردی هەوڵی خۆشاردنەوە دەدات. بەڕای من کارەکە لەتێنەگەیشتن لەکارەساتەکە بەپلەی یەکەم و دووەمیش

بێئاگابوونە لەدونیاو چۆنێتی پاراستنی یادەوەریی و ئاكارەكانی تراژیدییایەك هێشتا جیهان دانی پێدا نەناوە وەك جینۆساید.

**پرسیار:** ئایا ئاستی ئەو ترسە شاراوەیەی لای ئینسانی كورد هەیە بەرامبەر كوردبوونی خۆی، ترسێكە خاوەنی هێزێكی رۆشنبیریی وایە كە بتوانێت لەبری تۆڵە، خۆبكات بەهێزێك كە هەڵگری لێبووردن بێت. ئایا ئەم هێزە چەند دەستەڵاتی كوردی لێی بەرپرسیارەو چەندیش كۆمەڵگەی كوردی و رۆشنبیرەكانی بەرپرسیارن لەپیشاندانی؟

**خالد سلێمان:** كورد كە كەوتە بەر ئەنفال و دووایش ئاكارەكانی و قورسایی ئەو یادەوەرییە قورسەی لەدووای خۆیەوە بەجێیهێشت و یادكردنەوەی و ناساندنی بەجیهان، تووشی سەرئێشەو بێتاقەتیی هات و پەناشی بۆ ئەزموونەكانی دونیا لەم بوارەدا نەبرد. پەنای بۆ پرانسیپەكانی كاركردنی لەبواری جینۆسایددا نەبرد، یانی نەئاشكراكردنی تەواوی راستییەكان و نە بەدواداچوون و نەچاككردنەوەی دامەزراوەكان و نەقەرەبووی قوربانییەكان و لەكۆتاییشدا نەزیندووڕاگرتنی یادەوەرییەكان. هەموو ئەمانەش پرانسیپە سەرەكییەكانی كاری (عەدالەی ئینتیقالی)ن، كە دەبوایە ئەنفالی پێ بناسێنرایە بەدونیا.

ئەگەر كورد لەم پرنسیپانەوە (ئاشكراكردنی راستییەكان، بەدووداچوون و لێكۆڵینەوە، چاككردنەوەی دامەزراوەكان، قەرەبووی قوربانییەكان، زیندووڕاگرتنی یادەوەرییەكان) نەڕوانێتە ئەنفال و كارێكی



ناوخۆیی وەها بەرپا نەكات سەرنجی دونیای پێڕاكێشێت بۆ لای فایلی جینۆسایدی ئەنفال، ئەوا ناتوانێت لەكۆمەڵێك ئاهەنگی ماتەمینیی سواو بێتە دەرەوە.

دەربارەی ئەو پرسیارەی كە ئایا كورد توانای لێبوردنی هەیەو دەكرێت ترس لەئەنفال ببێتە سەرچاوەی هێزی لێبوردن لەناوەوەی مرۆڤی كورددا، هەر شتێك بڵێین دیسانەوە دەچینە سەر ئەو پرانسیپانەی دیاریكران و لەزۆر شوێنی جیهانداو لەلایەن دەزگای تایبەتەوە بەكۆمەڵكوژیی و جینۆساید دەكرێنە پردی پەڕینەوە لەیادەوەرییەكی تاڵەوە بۆ ئاستێكی تر، كە دەرفەتی ئەوە دەدات باس لەلێبووردن بكرێت.

گرفتی ئەنفال وەك تاوانێك دژی مرۆڤایەتی لەوەدایە تا تاوانبارەكان بەكارێكی رەوایانزانی بەو شێوە" بەربەرییە" مامەڵەیان لەگەڵ كورددا كردو بگرە بەماف خۆیان دەزانی خەڵك لەماف داماڵن. لەبەر ئەم خاڵە قوربانیی نازانێت كێ ببورێت لەكێ خۆش بێت، بەعس و كۆمەڵگا وێناكراوەكەی كە لەئاستێكی ئایدیۆلۆژییەوە گەیشتە ئاستێكی واقیعی و لەڕۆتیندا توایەوە، خۆی گلانە زەلكاوی " مەززەبی " یەوە، دەسەڵاتی نوێی عێراق بەهەمانشێوە لەهەمان زەلكاودایەو قوربانییەكان لەدۆخی قوربانی بوون و ناسنامەكەیدا نەهاتونەتە دەرەوە. ئیتر چۆن باسی كەلتوری لێبوردن بكەین؟ گرفتێكی تری مەسەلەكە لەوەدایە كەعەرەب و ژینگەی عەرەبی وەك چۆن بەدووای بەئەفسانەكردنی " هۆلۆكۆست" دا دەگەڕێن، ئاوەهاش و زیاتریش بەدرۆخستنەوەی ئەنفالدا دەگەڕێن و

داڵدەی تاوانبارەکانی بەعس دەدەن. بۆیە لەهەندێ ناوەندی " شیعە مەززەب" زیاتر تێبینی ناوەندی تری عەرەبی ناکرێت کەئەنفال بەلایەوە راستییەك بێت.

کەلتوری لێبوردن لەکاتێکدا پێناسەدەکرێت و جێگای لەکارەساتی ئەنفالدا دەبێتەوە، کە تاوانبارەکان دان بەتاوانەکەدا بنێن، هەروەها لەدادگادا ببینرێن بەهەر شێوەیەکیشبێت، تەنانەت ئەگەر لەهەر ولاتێکیشەوەبێت بڕفێنرێن و بەدیلکراوی بدرێنە دادگا، وەك چۆن ئیسرائیلییەکان " ئایخمانت " ی نازییان لەئەرجەنتینەوە هێنایە بەردەم دادگا.

لەئاستی ناوخۆیی کوردستاندا بەشێکی زۆر لەتاوانبارەکان چوونە ناو دەسەڵاتەوەو پێش ڕاپەڕینی 1991 " بەرەی کوردستانی" بەبەیانێکی لێبوردن لەتاوانەکانیان رزگارکردن. زۆریشیان لەدووای 2003 چوونە دەەوەی کوردستان. هەڵبەتە لەهیچ کاتێکدا داوای تۆڵەکردنەوە لەو تاوانبارانە ناکرێت، دادگایی نەکردنیان لەژێر هەر بیانویەکدابێت کارێکە هەرگیز نابێتە مایەی خەمڕەواندنەوەی قوربانییەکان و لەهەموو حاڵێکیشدا نابێتە هۆی جێگۆڕکێی نێوان رق و کینە و کەلتوری لێبوردن.

پەژارەی قوربانییەکان هەر لەچرکەساتی دەستپێکردنی تاوانەکەوە تا ئەو کاتەی داوای لێدەکرێت لەجەللادەکانیان خۆشبن، بەشێکە لەو کەلتوری لێبوردنە وا باسی لێوەدەکرێت، چونکە لەهەموو کاتێکدا ئامادەگی تەواوی لەنێوان قوربانی و جەللاددا هەبوو، بەڵکو پەیوەندییەکانی نێوانیان لەئاستێکەوە بەرەو ئاستێکی تر دەبرد و وەك



کەسی سێیەم دەردەکەوت. ئەمە با ئاسانی و بەبێ کاری تیۆری لەبەسەرهاتەکانی رزگاربووانی ئەنفالدا بەرچاو دەکەوێت.

ئەم پەژارەیە بەشێك نییە لەهەموو کۆمەڵگای کوردی و بەشێوەیەکی بەرچاو لەناو کۆمەڵگای ئەنفالکراودا رەچاودەکرێت. هەڵبەتە مەبەست لێرەدا تەنها لەپەژارەی تۆپزاوا و دووبز و قۆرەتوو و نوگرەسەلمان و شوێنەکانی تر نییە، بەڵکو ئەوەی ناو ئۆردوگاکان و کۆمەڵگای بێوەژنەکان و منداڵە بێنەواکان و ئەو واقیعەی ئەنفال لەدووای خۆیەوە بەجێیهێشت. دەتوانین بڵێین قوربانییەکان لەساڵی 1991 ئاگایان لەوە نەبوو کە زۆرێك لەجەللادە کوردەکانیان (جاشەکان) کەوتنە بەر بڕیاری لێبووردن. بەم مانایەش لێبوردنەکە بەسەریاندا سەپێنرا بەبێ تێگەیشتن لەماناو رەهەندەکانی.

کێ لەئەنفالەوە دەست پێدەکات؟

**پرسیار:** ئایا ئەدەبی کوردی بەتەعریفە جیاوازەکانی ئێوەوە بۆ ئەدەب چەند بەرپرسیارە لەبەردەم بیرنەکردنەوەدا لەئەنفال؟

**خالد سلێمان:** پێش هەموو شتێك پێویستە ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کەئێمە تا ئێستا ئەنفال لەدورەوە دەبینین و نەچووینەتە ناو وردەکارییەکانییەوە، هەروەها لایەنە شاراوەکانی تاوانەکەوە. هەر کارێکیش بەبێ وردەکارییەکانی ئەنفال ئەگەر ئەدەبیبێت یان فیکری و کەلتوری ئامانجی زیندووکردنەوە ناپێکێت. دیارە هۆکاری زەمەن رۆڵی

خۆی لەم بوارەدا هەیە و لەوانەیە باشترین دەقی ئەدەبی دوای نیوسەدەو لەسەر دەستی نەوەیەکی تری ئەدەبی کوردی دەرکەوێت نەك ئێستا.

بەڵام ئەوەی دەمەوێت تەئکیدی لەسەر بکەم زیاتر لەنەناسینی کۆمەڵگای ئەنفالدا دەردەکەوێت و زاڵبوونی خەیاڵ بەسەر دەقی کوردیدا، دیارنەبوونی شوێن و زەمەن و کاراکتەریزەنەکردنی توخمەکانی جینۆساید لەکاری فیکر و داهێناندا. بەڕای نووسین لەسەر سەدام حسێن و چوونە ناو بیۆگرافی ژیانییەوە کارێکە بۆ ئەنفال دەگەڕێتەوەو گەڕان بەدووای ئەو دونیایەی کوشتنی تیادا وەك ناسنامەیەکی تۆتال ناسرا. کەرەستەکانی ئەو ناسنامەیە کەخەڵکی کوردستان بوون، بەشێکی زۆر لێیان وردەکارییەکانی ئەو کوشتنەیان لایەو ئێستا لەئۆردوگاو شوێنە لەبیرکراوەکانی کوردستاندا دەژین. ئەوانەی وا لەنوگرەسەلمان و گۆپتەپەو دووبزو قۆرەتوو و تکریت گەڕانەوە، بەشێك لێیان دونیایان بەجیهێشت و ئەو کەسە کەمانەش ماون زۆر ناژین و تەمەنیان لەکۆتاییەکاندایە.

چیرۆك و بەسەرهاتی ئەو قوربانییە زیندووانە کەرەستەی ناساندنەوەی ئەنفالن بەکۆمەڵگای کوردی و وردبوونەوە لێیان دەبێتە بنچینەی کاری ئەدەبی و فیکری گەورە. کاری ئەفراندن و خەیاڵی ئەدەبی لەسەر ئەنفال لەوانەیە لەیادەوەری کوردیدا جێگای بێتەوە، لەدەرەوەی خەیاڵی کوردیدا کاری دۆکیومێنت و مێژووی زارەکی و کەرەستەو بەجێماوەی قوربانییەکان جێگای لێوردبوونەوەو کارکردنن.



ئەگەر بەشێوەیەکی تر قسە لەسەر ئەنفال و ناساندنی بەدونیا بکەین، پێموایە پێویستە لەسەرمان باس لەکۆمەڵێ خاڵی زۆر پراتیکانە بکەین کەتائێستا لەکوردستاندا بوونیان نییە.

جگە لەمۆزەخانەیەکی نیشتیمانی و مۆنۆمێنتیکی شیاو بۆ تراژیدیاکە، ئەبێ دامەزراوەیەکی نیشتیمانی هەبێت بۆ کۆکردنەوەی هەموو ئەو بەرهەمانەی لەسەری نووسراون و بەبەرهەم هاتوون و هەروەها ئەرشیفکردن و تۆمارکردنی ئەو شتانەی بەزارەکی ماونەتەوە. لەسیاقی هەر پرۆژەیەکی ئاوەهاشدا دەبێت لیژنەیەکی وەرگێڕان هەبێت بۆ وەرگێڕانی ئەو بەرهەمە فیکریی و ئەدەبی و دۆکیومێنتانەی لەبەردەستدان بۆ زمانەکانی دونیا.

لێرەوە دەتوانین لەئەنفالەوە دەستپێبکەین و بیخەینە ناو سیاقی کارکردنێکی وەهاوە، بتوانین لەڕێگایەوە باس لەناساندنی بەجیهان بکەین.

لەکۆتایدا دەمەوێت بڵێم ئەنفال تراژیدیایەکە پێویستی بەدووبارەکردنەوەی بە"هەواڵ" هەیە. دەبێت ئێمە توانای دروست کردنی هەواڵێکی نوێمان لەسەر هەموو ئاستەکانی کارەساتەکە هەبێت، هەواڵێك رووداوەکە بگەڕێنێتەوە بۆ بەرچاوی دونیا. ئایا ئەمە دەکرێ و کەی، ئێ، چۆن؟



# ئارام کاکەی فەلاح

**ئەو گەلەی ئاگایەکی تەواوی لەوردەکارییەکانی مێژووی خۆی نەبێت، بەدەیەها جاری تر، بەدەموچاوی ترو فۆڕمی ترەوە تووشی دەبێتەوە.**

**کاری گرنگ بۆ ئێمەی کورد ئەوەیە کە هەوڵبدەین کە ئەو کارەساتە دووبارە نەبێتەوە. ئەمەش کارێکی زۆری دەوێت و ئەوەی تائێستاش کراوە زۆر کەمە.**

ئارام کاکەی فەلاح



**پرسیار:** ئەگەر بهاتایە ئەنفال لەوڵاتێکی ئیسلامیدا روویندایەو هەروەها مانایەکی ئیسلامیشی پێنەدرایە، پێتانوایە ئەنفال بتوانرایە نوقمی بێدەنگییەکی وا بکرێت، هەم لەلایەن وڵاتانی دراوسێوە تا دەگاتە هەموو وڵاتە ئیسلامییەکانی دنیا، ئەوسا وڵاتانی ئەوروپاش؟

**ئارام کاکەی فەلاح:** لەڕاستیدا ئەگەر ئێمە بەوردی لەسیاسەت و بەرژەوەندییەکانی ورد بینەوە، بەڕوونی بۆماندەردەکەوێت کە بێدەنگبوون لەتاوانێکی وا پەیوەندی بەوەوە نییە کە لەوڵاتێکی ئیسلامیدا روویداوە یان ئەورووپی، بەڵکو پەیوەندی بەکۆی ئەو بەرژەوەندییانەوە هەیە کە زلهێزەکانی دونیا بەهەندێك وڵاتی ترەوە دەبەستێتەوە، لەپێش هەمووشیانەوە بەرژەوەندی ئابووریی و سەربازیی.

ئەو کاتەی کە ئەنفال روویدا لە 1988 دا، ڕژێمی بەعس هێزێکی گەورەبوو لەناوچەی خۆرەڵاتدا، دوو سێ وڵاتی بەخێودەکرد، ئەمە جگە لەبەخێوکردنی چەندەها گروپی سیاسی جیاواز جیاواز. وڵاتێکی دەوڵەمەند کە زلهێزەکان چەکی زۆریان پێ فرۆشتبوو، بازاڕێك بوو بۆ ساغکردنەوەی چەکی کۆن و پێداویستی سەربازیی تر کە ئەو وڵاتانە دەیانوویست مەغزەنەکانی خۆیان پاکبکەنەوە لێی. باشترین شوێنیش عێراق بوو. کە بەپەیوەندییەکی چڕەوە مێشك و گیرفانی بەو مەغزەنانەوە بەسترابووەوە.

وڵاتێك بوو چەكی لەدانیشتووانی خۆشتر دەویست، پیاوانێكی دروستكردبوو كە لەگەڵ چەكدا ژیانیان زیاتر بردبووە سەر وەك لەگەڵ ژن و منداڵەكانیاندا.

تاوانی ئەنفال جینۆسایدەو جینۆسایدیش لەشوێنی تر روویداوەو بێدەنگیشی لێكراوەو هەتا ئێستاش دەكرێت قسەكردن و بێدەنگی تەنها پەیوەندی بەگۆڕانی راگری

هێزەكانەوە هەیە، لێرەوە تەنها قسەكردنێك دەشێت بكرێت، قسەكردنە لەسەر بەرژەوەندیی و نامۆڕاڵیی لەسیاسەتدا. لەئەنفالدا بێدەنگییەكان دەمووچاوی جیاوازیان هەبوو بۆ زلهێزەكان، بەرژەوەندییەكی ئابووری لەپێش هەموو شتێكەوە بوو، لای وڵاتانی عەرەب، كە لایان عیراق سومبولی نەتەوەی عەرەب بوو، بێدەنگییەكەیان لەوێدا خۆی مات دابوو.

تەنانەت رۆشنبیرێكی وەك ( ئێدوارد سەعید ) كە ئەو كاتە لەرۆژنامەی ( حیاة ) و (كرمل) دا دەینووسی نەیتوانی پارێزگاری لەویژدانی پاكی خۆی بكات و خۆی لەهێرشی ئەنفال لەسەرەتادا بەبێئاگا دایە قەڵەم. وڵاتە ئیسلامییەكانیش بەمافێكی رەوای رژێمی بەعسیان دەزانی. عەرەبەكان سەدام–یان وەك پاڵەوانێك سەیردەكرد كە دەتوانێت نەتەوەی عەرەب یەك بخات و دژی داگیركەران بجەنگێت، وڵاتە ئیسلامییەكانیش ئەویان وەك سیمبولێك دەبینی، كە دژی كافران لەشەڕدایە، بۆیە نابێت بەهیچ شێوەیەك رەخنەی لێبگیرێت. كوردیش لەم هاوكێشەیەدا نەقورساییەكی ئابووریی هەبوو، نەقورساییەكی سیاسیی،



لەجوگرافیایەكدا لەسێ لاوە ئابڵووقە دراو، هەموو ئەو هۆیانە وایانكرد كە ویژدانێكی سەربەخۆ بۆ ئاشكراكردنی ئەو كاتەی ئەنفال نەمێنێتەوە.

هەر بۆ نموونە ئەگەر باسی ئەو ویژدانە دۆڕاوە بكەم و كیمیابارانی هەڵەبجە بەنموونە بێنمەوە، كە تەنها لەبەر ئەوەی كە ئێران ئەوسا لەگەڵ عیراقدا لەشەڕدا بوو بۆیە هەر زوو ئاشكرا بوو، بووەهۆی ئەوەی كە ئێران وەك پڕووپاگەندەیەكی شەڕ بەكاری بێنێت.

هەرئەوسا كاسێتێكی ڤیدیۆییان بۆ تەلەفیزیۆنی سویدی هێنا بۆ پەخشكردنەوە، بەڵام تا ئەو كاتە هیچ یەكێك لەزلهێزەكان سەرزەنشتی ئەو هێرشەیان نەكردبوو، بۆیە بۆ پەخشكردنەوەی پاساویان هێنایەوە كە گوایە پرۆگرامێكی زۆریان لا كەڵەكەبووەو كاتی پێنج خۆلەكیشیان نییە. كەچی هەر بۆ شەوەكەی پرۆگرامێكی نیو سەعاتییان لەسەر رزگاركردنی پشیلەیەك پەخشكردەوە.

هەفتەی پێشوو لەیادی بیست ساڵەی هەڵەبجەدا ( هانس بلیكس) كە نوێنەری نەتەوەیەكگرتووكان بوو بۆ لەناوبردنی چەكی ئەتۆمی عیراق، بەئاشكرا وتی كە(بەئاسانی دەتوانرا كارەساتی هەڵەبجە روونەدا، تەنها چاوسووركردنەوەیەك لەزلهێزەكانەوە، یان لەوڵاتێكی گەورەی ئەوروپییەوە بەسبوو، بۆ ئەوەی رژێمی بەعس ئەو كارەساتە نەكات)، بەڵام كەسیان بەرژەوەندییان لەگەڵ ئەوەدا نەبوو بێنە قسە. بۆ ئەنفالیش بەهەمانشێوە دەتواندرا رابگیرێت. بۆ ئەمەش دەبێت بەمۆڕاڵی خۆیاندا بچنەوە.

**پرسیار:** ئەو هۆکارانە چین کە ئەنفال لەهوشیارییەکی سیاسی سادەوە کە تەنها لەیادکردنەوەی سەرپییانەی سالآنەدا قەتیسبووە، دەگوازێتەوە بۆ هوشیارییەکی کەلتووری، لەو بێدەنگییەی کە خاوەنی قسە نییە، دەگوازێتەوە بۆ بیرکردنەوەیەك بەدەنگی بەرز.

هەروەها ئەم بێدەنگییە چەند پەیوەندی بەکورد خۆیەوە هەیە، هەم لەئاستی بەرپرسیارێتی کۆمەڵگای کوردی بۆ ئەنفال و هەم لەئاستی دەسەڵاتی کوردی خۆیدا؟

**ئارام کاکەی فەلاح:** بەداخەوە ئەنفال نەبووە بەهۆشیارییەکی کەلتووری و لەیادکردنەوەیەکی سەرپێیانە، کە ساڵی جارێك پێشوازییەکی چاوتەڕانەی لێدەکرێت هیچی تر نییە، لەکوردستان و لەدەرەوەش هەر وایە، پرسەکۆڕێك و دوو سێ وتاری بەسۆزو چەند شیعرێکی کرچ و کاڵ، ئیدی خواحافیز تا ساڵێکی تر.

تۆ ئەگەر بیرکردنەوەیەکت بەدەنگی بەرز دەوێت، دەبێت ئیشی جدی بۆ بکەیت، ئەمەش پەیوەندی تەواوی بەکوردو حکومەتی هەرێم و حزبەکانەوە هەیە، دوایی بەڕۆشنبیرەکانییەوە، ئێمە هەموومان کەمتەرخەمین لەئاست ئەو نەکردنە بەهۆشیارییەکی کەلتووری. لەپێش هەموو شتێکدا دەبێت ئێمە حورمەت بۆ مرۆڤی خۆمان بگەڕێنینەوە، دەبێت نرخی مرۆڤ لەو ئاستە نزمەی کە هەیەتی بەرە بەرە بەرزبکەینەوە، ئێمە دەبێت دونیایەك شت بگۆڕین، ئێمە ناتوانین لەلایەك ئەنفال بکەینە هۆشیارییەکی کەلتووری و لەولاوە دیموکراتیی



راستەقینەمان نەبێت، ناتوانین لەلایەك بەویژدانێکی پاکەوە هەڵەبجە لەتراژیدیایەکی پڕ فرمێسکەوە بگوازینەوە بۆ تراژیدیایەك لەناو هۆشیاریداو لەلایەکی ترەوە چاو لەگەندەڵیی بپۆشین. بۆ ئەمەش حکومەتی هەرێم و حزبەکان لێپرسراوی یەکەمن و زۆربەی کارەکان لەئەستۆی ئەواندایە، من لەسەفەری ئەم جارەمدا بۆ کوردستان گەنجانێکم بینی کە ئاگایان لەئەنفال نییەو هەڵەبجەش تەنها یادگارێکی رەشەو روویداوەو تەواو. ئەو گەلەی ئاگایەکی تەواوی لەوردەکارییەکانی مێژووی خۆی نەبێت، بەدەیەها جاریتر بەدەموچاوی ترو فۆڕمی ترەوە تووشی دەبێتەوە.

لای ئێمە ئەم شار ئاگای لەشاری تەنیشتی نییە، لەهەڵەبجە خۆپیشاندان دەکرێت و داوای ماف دەکرێت و لەشارێکی تر پشتگیری لێناکرێت، لەسلێمانی بەهەزارەها لەبەر شتێکی گرنگ دێنە سەر شەقامەکان و لەشارێکی تر دەڵێن ئەوە پەیوەندی بەخۆیانەوە هەیە. ئێمە ئەگەر میللەتێکین، هەر تەنها مێژوویەك و جوگرافیاو زمان نامانکات بەگەل، هەرچەندە خەریکە زمانەکەشمان وەك خۆمان پەرت دەبێت، بەبێئەوەی بۆ چارەسەرکردنی بگەڕێینەوە بۆ زمانێکی ستاندارت بەپێوانەی مێژووییەتی بۆ زمان، بەڵکو ئێمە بۆ هەستکردنێکی هاوبەش بەئازارەکانی یەکتر پێویستمان بەخەونێکی هاوبەشیش هەیە کەپێکمانەوە ببەستێتەوە، تەنها بەمانە گەلێکمان دەبێت کە پایەیەکی پتەوی دەبێت. ئێمە لەو جوگرافیا گەمارۆدراوەی تیایدەژین تاکە گەرانتییەکمانە کە بەبرینداریی و کۆیلەیەتییەوە نەژینەوە.

بەدرێژایی مێژووی دروستبوونی دەوڵەتی عیراق، هەرێمی ئێمە بەزۆر لکێندرا پێوەیی و لەوێوە حوکم دەکرێین، ئێستا ئێمە لەهەرێمەکەی خۆماندا کە نەخشەکەی ساڵبەساڵ بچووکتر دەبێتەوە سووکە حوکمێکمان بەدەستەوەیە هی ئەوەیە کە حکومەتی ناوەندی لاوازەو گرفتی گەورە لەبونیادیدا هەیە، هەچ کاتێ گرفتەکانی چارەسەرکران زۆر شت دەگۆڕدرێن و لەدەستمان نامێننەوە ئەگەر بەزووترینکات زمانێکی ستاندارتی نووسینی هاوبەش و خەونێکی هاوبەش و هاووڵاتیانی سەربەست و کردنەوەی دامەزراوەی مەدەنیی و بودجەیەکی هاوبەش و سوپایەکی هاوبەش و بەبێلایەنکردنی تەلەفزیۆن و سەربەستی تەواوی مێدیاو چەند حزبێکی ئۆپۆزۆسیۆنی راستەقینە نەبێتە کارێکی هاوبەشی هەموان، من ناڵێم با هەر بەیانی هەمووما ببینە مرۆڤێکی دیموکرات، چونکە داواکردنی ئەوە هەروا ئاسان نییە، بەڵام هیچ نەبێت هەوڵبدەین تا مێژوو خۆی دووبارە نەکردۆتەوەو ئێمەش لەفرمێسك زیاتر پێمان نابێت بۆ دیالۆگمان لەگەڵ دونیادا. ئەگەر هەموو ئەمانە پێکەوە نەکەین قەت ناتوانین بۆ نموونە ئەنفال بکەینە هۆشیارییەکی کەلتووری.

**پرسیار:** ئەو پێشنیازە تایبەتییانەی ئێوە چین بۆ ئەوەی ئەنفال وەك کارەساتێکی سیاسی مێژوویی لەیادەوەری ئینسانی کوردا بەچەشنێك بمێنێتەوە کە هەمیشە جێی ئاوڕدانەوەو قسەکردن بێت لەسەری لەلایەن ئەو نەوانەی کە لەدوواڕۆژی کۆمەڵگای ئێمەدان؟



**ئارام کاکەی فەلاح:** لەوەڵامدانەوەمدا بۆ پرسیاری دووەم، زۆرێکی وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارەشی لەخۆ گرتبوو، ئەوەی دەمەوێت بیخەمە سەری ئەوەیە کە پێشئەوەی ئێمە بتوانین ئەنفال بەدونیای دەرەوە بناسێنین، دەبێت بەخۆمانی بناسێنین. بەو نەوەیەی کە ئاگای لەو سەفەرانە نییە بەرەو مەرگ بران، بۆ ئەمەش حکومەتی هەرێم و حزبە کوردییەکان لەپێش هەموانەوە ئەرکێکی مێژوویی و ئەخلاقییان لەسەرشانە بەم کارە هەستن، دەبێت ئەوان لەجدێتی ئەم کارە تێبگەن بەو شێوەیە نا کە هەمووما لەدادگاییکردنەکانی تاوانبارانی ئەنفالدا بینیمان، کە جگە لەکۆمیدیایەك زیاتر هیچی تر نەبوو، ئێمە پێویستمان بەکەسانی دڵسۆزە بەم کارانە هەستن، کەسانێك کە بەڕاستی لەئاستی گەورەیی ئەو کارەساتەدا بن. دەبێت حکومەتی خۆمان کەسانی بەتواناو لێهاتوو لەم بوارانەدا بدۆزێتەوە، چ کردنیان بەپسپۆڕ بۆ مەنهەجی خوێندن و کردنی بەشێکی تریان بەنمایندەی کوردو ناردنیان بەوڵاتانی جیهاندا بەبەڵگەنامەی بەهێزو دۆکومێنتەوەو بەستنی چەندەها کۆنفرانس لەکوردستان و وڵاتانی تردا، ئێمە کەسانێکمان هەن کە بۆ ئەنفال کارێکی زۆریان کردووەو کەسیش نایانناسێت و نایەڵن زۆرتر بێنە پێشەوە، رەنگە هەر لەبەرئەوەی کەڕەخنەیەکیان گرتووە، بەڵام ئەگەر رێگەنەدرێت ئەوا زیانێکی گەورە لەئەنفال دەدرێت، من نازانم بۆچی ئێمە هێندە لەڕەخنە دەترسێین، تەنها رەخنەیە کە بەهۆشیارییەوە وەك نەتەوە بەهێزمان دەکات. ئەوەی کە جێگای دەستخۆشییە لەماوەی ئەم دوو سێ ساڵەی

دواییدا چەند کتێبێکی باش لەسەر هەڵەبجەو ئەنفال نووسران و بڵاوکرانەوە، لەگەڵ وەرگێڕانی چەند کتێبێکی گرنگی تر وەك ( دڵرەقی و بێدەنگیی) کەنعان مەکییە کە یەکێکە لەکتێبە پڕبایەخەکان، هەروەها بەستنی ئەو کۆنفرانسەی کە ماوەیەك پێش ئێستا لەهەولێردا بەستراو کەسانێکی زۆر داوەتکران کە دیسانەوە مایەی دڵخۆشییە.

**پرسیار:** ئایا ئەدەبی کوردی بەتەعریفە جیاوازەکانی ئێوەوە بۆ ئەدەب چەند بەرپرسیارە لەبەردەم بیرنەکردنەوە لەئەنفال؟

**ئارام کاکەی فەلاح:** لەڕاستیدا من لەلایەك پێمخۆشە کە ئەدەبی کوردی خۆی نەداوە لەقەرەی کارێکی وا گەورە. من کەمێك بەگومانەوە لەو ئەدەبە دەڕوانم کە تەنها بۆ کارەساتە گەورەکان دەنووسرێن، نووسەری هەنگاری ( ئیمری کێرتێز ) کە ساڵی 2002 خەڵاتی نۆبڵی لەئەدەبدا وەرگرت، خۆی یەهودییەو چەند ڕۆمانێکی تەنها باسی ژیانی یەهودییەکان دەکات لەئوردوگاکانی نازییەکان بەتایبەتی ئوردوگاکانی ئاوشویتز، من هیچ چێژم لێنەبینی. ڕۆمانی ( پیاوی بێ چارەنووس )ەکەی کە ساڵی 1975 نووسیویەتی بەچارەکێکی ( شاری مۆسیقارە سپییەکان) جوان نییە، ڕەنگە یەکێك بێت و بڵێت ئاخر تۆ کوردی بۆیە ئەم ڕۆمانەت پێجوانترەو ئەوی تر نا، بۆ یەهوودییەك ئەوی تر جوانترە، گرفتەکەش ڕاست لێرەدایە. ڕاستە ڕۆمانی ( شاری مۆسیقارە سپییەکان ) باسی ئەنفال دەکات، بەڵام شاکاری ئەم کارە لەوەدایە کە بەس تەنها باسی ئەنفال ناکات، بەڵکو باسی دەیەها بابەتی گرنگیتر دەکات و چەندەها دێڕی تیایە کە هەموو کەسێك دەتوانێت لەڕوحیدا هەڵیبگرێت، جا ئەم کەسە کورد بێت یان نەبێت. جوانی ئەدەبێك تەنها بۆ ئەوە نییە کە گەلەکەی نووسەر چێژی لێوەربگرێت، بەڵکو ئەدەب بۆ هەموو مرۆڤایەتییە، بۆیە دەبێت لەئاستێکی بەرزدا بێت، دەنا زوو وندەبێت. شیعرێکی زۆر بۆ هەڵەبجە



نووسران، بەڵام زۆر کەمیان مانەوە، ئەوەی شیعرێکی جوانیشی بۆ هەڵەبجە نەنووسی ئیدی بەوە نابێت بەهاوڵاتییەکی خراپ، هەروەك چۆن چەند دێڕێکی جوان ناتکەن بەنیشتمانپەروەر، بۆیە ئەم بیرکردنەوەیە باش نییەو تووشی تێکستی زۆرمان دەکات کە زوو دەمرن، چونکە زۆربەی زۆری ئەم تێکستانە بەزۆر دەنووسرێن و فشاری گروپ دروستیان دەکات نەك ڕۆحێکی داهێنەر. ئێمە دەتوانین لەڕۆحێکی داهێنەر چاوەڕوان بین، تێکستێکی گەورەمان بداتێ تا کارەساتەکانمان باشتر لەیادەوەریدا بهێڵێتەوە، بەڵام ئەم چاوەڕوانییە لەهەموو کەسێك ناکرێت.

**پرسیار:** ئایا ئاستی ئەو ترسە شاراوەیەی لای ئینسانی کورد هەیە بەرامبەر کوردبوونی خۆی، ترسێکە خاوەنی هێزێکی ڕۆشنبیریی وایە کە بتوانێت لەبری تۆڵە خۆی بکات بەهێزێك کە هەڵگری لێبووردن بێت؟ ئایا ئەم هێزە چەند دەسەڵاتی کوردی لێی بەرپرسیارەو چەندیش کۆمەڵگەی کوردی و ڕۆشنبیرەکانی بەرپرسیارن لەپێشاندانی؟

**ئارام کاکەی فەلاح:** لێبوورن چەمکێکی گرنگ و جەمسەرێکی جوانی ژیانە لەمێژووی مرۆڤایەتیداو لەهەموو زەمەنێکدا هەمیشە وەك پرسیارێکی سەخت و ئەکتوێل دێتە پێشەوە. لێبووردن و تۆڵەکردنەوە دوو پرۆسەی زۆر تایبەتین و لەیەکێکەوە بۆ ئەوی تر دەگۆڕێن، بەڵام ئەم دوو پرۆسەیە کە هاتنە ئاستی هەموو کۆمەڵگا ئەوسا ئیتر ڕەهەندیتر وەردەگرێت. لێرەوە ئیتر دەسەڵاتی کوردی و ڕۆشنبیرەکانی بەرپرسیاری یەکەمن لێی.

با لێرەدا من دوو نموونە لەدوو ڕۆمان بهێنمەوە بۆ زیاتر ڕوونکردنەوە. ئەوانیش ڕۆمانی ( شاری مۆسیقارە سپییەکان )ی بەختیار عەلی و

رۆمـانی ( بـەبێ خـوێن )ی ئەلیکسـەندرۆ باریکۆیـە. لەشـاری مۆسـیقارە سـپییەکاندا سـامری بـابلی رەنگـبێ روونتریـن نموونـەی تاوانبارێـك بێـت بەرامبـەر نەتەوەیـەك کردوویـەتی و لێـی پەشـیمانە، ئـەو کەسانەشـی دەیانەوێت حوکمی بدەن، ئەو کەسانەن کە بەشـێوەیەکی تـەواو تاوانیـان بەرامبـەر کـراوەو سـاتێکی زێڕینیـان لەبـەر دەسـتایە کـە تاوانەکـە نەیکوشتوون و دەتوانن حەقی خۆیان بەدەسـتی خۆیـان بکەنـەوە، بـەڵام وەك دەبینن ئاسان نییـەو ئـەو دیالۆگانـە بیننـەوە بەرچـاوی خۆتـان کـە قوربانییەکان لەبەینی خۆیاندا دەیکەن تا دەنگە دەنگ و شـەڕیش لەگـەڵ یەکتردا، لێرەدا دەبینین کە یادەوەرییەکی برینـدارو هۆشـیاریی و ویـژدان ئاوێتـەی یـەکتردەبن و کەسـیان ناگـەن بەئـەنجام. باشـە ئـەوە سـامری بابلیشـت کوشـت، ئـەی دوایـی؟ چـەندەها سـامر دروسـتدەبنەوە، تاقـە رێگایەك ئەوەیە کۆمەڵگایەك دروسـتبکرێت کـە بابـەتی وەك بابلییـان تیـا نەبێت.

لەڕۆمانەکـەی باریکۆشـدا کچـە پاڵەوانەکـە کـە خـۆی لەچـەکدارەکان دەشارێتەوەو چەکدارەکان بـاوکی دەکـوژن کـە تاوانبـارەو بـەژەهر زۆری لەچـەکدارەکان کوشـتووە، ئـەم کچـە گـەورە دەبێـت و دەیـەوێت تۆڵـە بکاتـەوە، بـەڵام لـەجیاتی تۆڵـە لـەو چـەکدارەی کـە بـاوك و براکـەی کوشـتووە، ئـەم دێـت و دڵـداریی و خۆشەویسـتی دەکـات. خۆشەویسـتی بەتاقە تۆڵەیەك دەبینێـت کـە لـەجیاتی ئـەوەی بەرامبەرەکـەی بکوژێـت، دەیگۆڕێت.



ئـەم دوو نموونەیـە دوو نموونـەی زینـدوون کـە وامانلێـدەکات بـیر بکەینـەوە. لێـرەدا بـۆ مـن گرنگـە کـە خوێنـەر بەهەڵـە لـەمن تێنـەگات و وابزانێت من بمەوێت دڵداری لەگەڵ ئەوانەدا بکەین کە ئەنفالیان کردین، نا من مەبەستم ئـەوە نییـە، هەرچـەندە ئەگـەر ئێمـە بتـوانین کەسانی وەك سـامری بـابلی بگـۆڕین و لەدڕنـدەوە بیانکەینـەوە بـەمرۆڤێکی خـاوەن ویژدان، با هەوڵبدەین بیانگۆڕین. ئەوەی گرنگە بیزانین ئەوەیـە کـە ئـەوە عەرەب نییە وەك نەتەوە کە ئەنفالی کـردین، بـەڵکو رژێمێکـی نـەخۆش و دڕندە بوو کە پیاوانی دڕندەی دروستکرد تا ئەو کارانەی بۆ بکـەن، کـاری گرنگ بۆ ئێمەی کورد ئەوەیە کە هەوڵبدەین کـە ئـەو کارەسـاتە دووبـارە نەبێتەوە. ئەمەش کارێکی زۆری دەوێـت و ئـەوەی تائێسـتاش کـراوە زۆر کەمە.

# دڵسۆز حەمە



**گۆڕینی ئەنفال لەهۆشیاریەکی سادەوە بۆ هۆشیاریی سیاسیی لەهەرە گرنگترین ئەو پرۆسانەیە کە لەسەرشانی دەسەڵاتی سیاسیی و نوخبەی رۆشنبیرییە.**

دڵسۆز حەمە



**پرسیار**: ئەگەر بهاتایە ئەنفال لەوڵاتێکی ئیسلامیدا روویندایەو هەروەها مانایەکی ئیسلامیشی پێنەدرایە، پێتانوایە ئەنفال بتوانرایە نووقمی بێدەنگییەکی وا بکرێت، هەم لەلایەن وڵاتانی دراوسێوە تادەگاتە هەموو وڵاتە ئیسلامییەکانی دونیا، ئەوسا وڵاتانی ئەوروپی؟

**دڵسۆز حەمە**: بەدرێژایی مێژوو هێزە شەڕکەرەکان ناوێك و بەهانەیەکیان هەیە بۆ بەرپاکردنی شەڕەکانیان، لەشەڕی تەڕوادەوە تا دەگاتە گەردەلولی بیابان، پێدانی مانایەکی ئیسلامی بەهەڵمەتەکانی ئەنفال و ناونانی بەمانایەکی ئیسلامی بەدیوێکدا راکێشانی سۆزو پشتیوانی دونیای عەرەبی و ئیسلامی بۆلای خۆی بەدیوێکی تردا فراوانترکردنی پانتایی ئەو تەوهین و سوکایەتیکردنە بوو کە رووبەڕووی مرۆڤی کورد بەگشتیی و قوربانیانی ئۆپەراسیۆنەکە بەتایبەتی کرایەوە، کە زۆرێك لەوانە خەڵکانی سیڤیل و هەڵگری ئایینی ئیسلام بوون، بێبەریکردنی ئەوانە لەبەشێك لەشوناسی ئایینی خۆیان ئامرازێکی تر بوو لەئامرازە زۆرەکانی ئازاردان و سوکایەتیکردن بەقوربانییەکان، بەپێی تەفسیری شەرعی ئەنفال تەنها لەهەمبەر غەیرەدیندا رەوایەو ئەنفالکردنی هێزێکی ئیسلامی لەهەمبەر ئیسلامێکی تردا حەرامە، بەڵام وەختێك خەڵکێکی زۆر دەکەونە بەرشاڵاوی کوشت و کوشتارو لەناوبردنی فیزیکی و تاڵانکردنی سەرو ماڵیان بەمانای رووتکردنەوەشیان لەو شوناسە ئیسلامییەی کە پێموایە تەواوی ئەو خەڵکە سادەو ساکارانەی بەر شاڵاوی ئەو کارەساتە کەوتن شانازییان بەو شوناسە ئیسلامیەوە کردووەو

دەیکەن، رژێمی بەعس زۆر کاری لەسەر ئەمە کردووە، ئەگەر سەرنج بدەینە تەواوی ئەو شەڕانەی ئەو رژێمە لەناوچەکەدا بەرپایکردن چی لەگەڵ خەڵکی ناو وڵاتەکە خۆی، چی لەگەڵ دەرودراوسێکاندا، هەمیشە ناوێکی ئیسلامی داوە بەشەڕەکان لەقادسیەوە بۆ ئەنفال تادەگاتە ئومولمەعارك و تەوەکەلنا عەلاالله، تەواوی ناوی هێزەکان و بەتالیۆن و گروپە جیاوازەکانی ناوی ئیسلامی و بەناوی سەرکردە مێژووییە عەرەبە ئیسلامییەکانەوە بوون، هێزی سەعدو حطین و حیدرو خالیدی کوڕی وەلیدو قەعقاع و یەرموك و هێزەکانی اللەاکبرو ئیدی بەوجۆرە، ئەوە بەکارهێنانێکی سیستماتیك و فێڵبازانەی ناوە مێژوویی و پیرۆزەکانی ئیسلام بوو بەمەبەستێکی ستراتیژی و سیاسی، راکێشانی پشتیوانی دونیای عەرەبی و ئیسلامی لەکاتێکدا ئەو رژێمە لەشەڕێکی تاقەتپڕوکێندا بوو لەگەڵ ئێران، هەرچەندە لەناوەڕۆکدا رژێمێکی نائایینی بوو، بەڵام لەو ساتەوەختەدا ئەو رژێمە تۆتالیتاریی و ئیستیبدادیە توانیبووی دونیای عەرەب لەسەر هەردوو ئاستی شەقامی عەرەبی و دەسەڵاتەکانی عەرەب و تەنانەت نووخبەی عەرەبیش بۆ خۆی راکێشێت و ویژدانی دەیەها فیگەری سیاسی و رۆشنبیریی و هونەریش بکڕیت و بێدەنگیان بکات، بەتایبەت لەئاستی ئەو هەڵسوکەوت و مامەڵە خوێناوییەی کە لەگەڵ خەڵکی عێراق بەگشتیی و کورد بەتایبەتیدا دەیکرد، تا رووداوانی کارەساتێکی ترسناك و نامرۆڤانەی وەکو ئەنفالەکان کە ئیدی ئاستی وەحشیگەریی و رەهەندی بێمۆراڵی و دڵڕەقی و درندەگەرایی دەگاتە لوتکەو هیچ سنوورێك نامێنێتەوە بۆ درندەیی و دڵڕەقی تێپەڕنەبوویێت،



حیکایەتەکانی ئەنفال و رووداوەکانی ترسناکترین فانتازیای رۆحی شەڕەنگێزیی و درندەگەرایی دەسەڵاتێك بەرجەستە دەکات کە لەوپەڕی دۆخێکی هێستریداو لەدۆخی نەبوونی هیچ لەمپەرێکی ئەخلاقی و یاسایی ناوخۆیی و نێودەوڵەتیدا ئەوپەڕی مومارەسەی سروشتی دەسەڵاتی هێستری خۆی نمایشدەکات.

هۆی نوقوومکردنی ئەنفال لەبێدەنگیداو لەوساتەوەختە مێژوییەدا چەند فاکتەرێك بوون، کە بێگومان یەکێك لەو فاکتەرانەش ئەو جوگرافیا ئیسلامیە بوو کە شانۆی روودانی ئەو کارەساتە بوو، نەك لەبەر سروشتی ئیسلامی ئۆپەراسیۆن و ناسنامەی ئیسلامی ئەو سوپایەی کە ئەنفالی ئەنجامدا هەروەها ئەو ساڵانەش رژێمی بەعس هێشتاکە دەتوانرا لەژێر پێناسەی رژێمێکی نائایینیدا پێناسەبکرێت، بەڵکو مەبەستم ئەو چوارچێوە جوگرافیەی کە لەڕۆهەڵاتی ناوەڕاستدا وڵاتانی ئیسلامی لەخۆگرتووە، کە زۆربەیان دەسەڵاتێکی نادیموکراسی و تۆتالیتاری و سەپێنراوی سەر ئیرادەی خەڵکن، کەسروشتێکی سیاسیی هاوبەشیان هەیەو عێراقیش پارچەیەکە لەو جوگرافیایە، زۆربەی ئەو سیستمانە نەك میدیای ئازادو سیستمی سەرچاوەی زانیاری سەربەخۆ پیادەناکەن، بەڵکو تەواو بەپێچەوانەوە هەڵسوکەوتی ئیستیبدادی و رێوشوێنی زۆر توندو هەستیار پیادەدەکەن لەگەڵ میدیاو پانتایی کارکردنی میدیادا، بەڵکو ئەوان بۆ خۆیان خاوەنی میدیاو کەسانی هەڵسوڕاوی ناو میدیاکانیش بوون، بەتایبەتی لەسەردەمی روودانی ئەنفالدا کە هێشتا سەتەلایت و ئینتەرنێت بەو شێوەیەی ئێستا فەراهەم نەبوو، شۆڕشی پەیوەندییەکان

لەسەرەتادا بوو، لانی کەم، لەخۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا، ئیدی چۆن دەکرا بەشێوەیەك لەشێوەکان تیشك بخرایەتە سەر رووداوێکی وا کە لەبەشێکی دونیای ئیسلامی و عەرەبیدا لەگەرمەی روودان و زیندەبەچاڵکردنی ئەو خەڵکەدا بوون؟؟!!

ئەمە بەمانای ئەوە نییە لەحاڵی ئێستادا میدیای دوای جیهانگیریی و سەتەلایت و شۆڕشی پەیوەندییەکان میدیایەکی راستگۆترن لەگەیاندنی کارەسات و ئیدی تاوانی شاراوە لەدەڤەری رۆژهەڵات و دونیای ئیسلامیدا ناکرێت بێدەنگی لێبکرێت، بەڵکو هەمان ئەو دەسەڵاتانەش لەحاڵی ئێستادا هەر ئەوانەن خاوەنی دەزگاو سەرچاوەکانی زانیاری و توانا مادیییەکان و رەهەندی فیکری و ئایدیۆلۆژی و جیهانبینی ئەو دەزگایانەن، کە لەئێستاشدا بۆ جۆرێك لەجۆرەکان بێدەنگیی و تاریکی دەخەنە سەر تراژیدیترین روداوێك کە لەمێژوی نوێدا روویدابێت.

دوو پێکهاتەی گرنگ رۆڵیان هەیە لەفۆرمۆلەکردنی کاراکتەرو شوناسی هێزی پەلاماردەردا بێجگە بەرچاوگرتنی ئەو توانا ئابوریی و سەربازیی و تۆکنۆلۆژییە خەیاڵییەی لەدەستی ئەو هێزەدا بوون. ئەو دوو فاکتەرەش، ئامادەیی فەرهەنگی ئایینی و فەرهەنگی خێڵەکین لەپێکهاتەی کاراکتەری ئەو دەسەڵاتەو هێزەکانی سەربەو دەسەڵاتە تا سنووری بەرهەمهێنانی فاشیزم.

ئایینی ئیسلام بەئاراستەی بەرهەمهێنانی تاکرەویی و دەسەڵاتێکی رەها، بەداوەت بەئاراستەی بەرهەمهێنانی فەرهەنگی هێزو بەرهەمهێنانی عەقڵیەتی هەیمەنەو تاڵان و برۆ، فەرهەنگی بەداوەت بەهەموو رەهەندە



ناعەقڵانییەکانیەوە لەنەستی کۆمەڵگای عەرەبیدا ئامادەییەکی هێندە بەهێزی هەیە تاهەنووکەش گرفتی گەورەی تەنانەت بۆ نوخبەی رۆشنبیری عەرەبیش دروستکردووە کە نەتوانێت لەگەڵ دونیادا دیسکۆرس و دایالۆگ بەرهەمبێنێت، ئەم فەرهەنگە هەموو گریمانەکان وەکو هەر ئۆپەراسیۆنێکی خێڵەکی نێوان دوو خێڵ پێدراوەکانی دەرەوەی خۆی، گۆڕانەکان و چەمکەکانی پێکەوە ژیان و پێکەوەهەڵکردن و دیموکراسی ناسنامەی کۆمەڵگاکانی دەردەوەی خۆی، هەموو ئەوانە بەبیدعەو بوونیادێکی گوماناویی دەبینێت، زۆر بەزەحمەت دەتوانێت جیاوازییەکان قەبوڵبکات، باوەڕ بێنێت کە دەکرێت راستی لەجێگایەکی تریش بوونی هەبێت، ئەم تەرزە بینینەی دونیا لەکۆتاییدا باشترین و بەپیتترین زەمینەن بۆ گەشەکردنی توندوتیژیی و پاکتاوکردنی ئەوی دی و سەپاندنی ئیرادەی هێزو شەڕەنگێزیی لەجێگای عەقڵ و قەبوڵکردن و پێکەوەژیان، لەڕاستیدا ئەوانە سروشتی ئەو هێزەبوون کە ئەنفالیان ئەنجامدا، دیارە ئەو کارەساتانەی لەچوارچێوەی وڵاتێکی نادیموکراسی ئیستیبدادی داخراوی وەکو عێراقی هەشتاکاندا روودەدات کەمتر چانسی بڵاوبوونەوەو پێزانین وەردەگرێت وەك لەدونیایەکی کراوەتردا، زۆرن ئەو کارەساتە مرۆییانەی بەردەوام روودەدەن و لەسەر ئاستی جیهان بێدەنگییان لێدەکرێت، ئەنفالیش یەکێکە لەدڵتەزێنترین کارەساتەکان کەلەسەدەی رابووردوودا روویدا، بێدەنگبوونی دونیا لەئاستی ئەو کارەساتانەو ئەنفال بەتایبەتی بەشێوەیەکی گشتیی هۆکاری ئەو مۆراڵە سیاسیەیە کە جیهان بەڕێوەدەبات، بەبڕوای من بێدەنگبوونی

هەریەکێك لەو ئاستانەی لەپرسیارەکەدا هاتوون هۆکاری تایبەتیان هەبووە کە هەندێکیان جیاوازن لەوی دی، ولآتانی دراوسێ کە هەموویان گرفتێکی هاوبەشیان هەیە کە ئێمەی کوردین، ، ئەم حاڵەتە جیۆپۆلەتیکە، ئەم دراما جوگرافیە لەزەمینەوە گوێزراوەتەوە بۆ ناو رەهەندەکانی رووبەڕووبوونەوە، لەقازانجی هەریەك لەئێران و تورکیا و عێراق سوریایە کە کوردەکان جینۆساید بکرێن و بتوێنەوەو لەناوبچن، هەربۆیە بێدەنگکردن لەئۆپەراسیۆنی ئەنفال لەلایەن دراوسێکانەوە مەسەلەیەکی چاوەڕانکراوەو مۆدێلی نامرۆڤانەی سروشتی دەسەڵاتی سیاسی ئەو ولآتانەیە کە خاکی کوردستانیان داگیرکردووە، کە مرۆڤی کورد بوونیادێکی پلە دووە، ژیان و هەبوونی بایەخێکی گرنگی نییە، لەدیدی ئەو دەسەڵاتانەوە رووداوێکی وەکو ئەنفال و قەڵاچۆکردنی بەکۆمەڵی ئینسانی کورد لەقوڵاییدا مایەی دڵخۆشیی ئەودەسەڵاتانەن کە هاوبەشن لەداگیرکردنی کوردستاندا، بەڵام وەختێك لەململانێی شەڕی عێراق ئێراندا، ئێران یەکسەر هەواڵی کیمیابارانکردنی هەڵەبجەی بەدونیادا بڵاوکردەوە، ئەو دونیایەی لەوساتەوەختەی شەڕدا بەتەواوی رۆژئاواو رۆژهەڵاتەوە پشتیوانی رژێمی بەعسیان دەکرد، بەکارهێنانی هەڵەبجە بەکارهێنانێکی سیاسی ئێرانییەکان بوو لەوکاتەدا نەك سۆزو بەزەیی و دەنگهەڵبڕین لەئاستی تاوانێکدا، ئاستی دووەمیان ولآتانی ئیسلامی، کە زۆرێك لەوانە عەرەبەکانن، دونیای ئیسلامی و دونیای عەرەبی بەتایبەتی، دونیایەکە لێوانلێوی کێشە ئابووری و دیموکراسی و فەرهەنگیەکان، دونیایەکە رژێمە عەرەبە تۆتالیتارو چەپێنەرەکان لەلایەك پاشکەوتەیی و



ئامادەیی بەهێزی فەرهەنگی بەیەکاچووی عەرەبیزم–ئیسلامیزم زەمینەیەکی هێندە داخراوی فەراهەمکردووە کە تەنانەت نوخبەی عەرەبیش کەم تا زۆر نەیتوانیوە خۆ لەکاریگەرییەکانی بپارێزێت، هیچ بەلامانەوە سەیر نەبێت کە عەرەبەکان تەنانەت ئەوانەی لەعێراقیشدا ژیاون و دەژین کەم تا زۆر هاوسەردەمی رەفتارو جەوری رژێمی پێشویان تاقیکردووەتەوە، بەڵام وەختێك قسە لەسەر ئەنفال و کۆکوژیی میللەتێك دەکرێت خیتابی عەرەبیزم–ئیسلامیزم خیتابێکی ترسناکی داخراوی دەسەڵاتی عەرەبی و شەقامی عەرەبین پێکەوە، بەتایبەتی لەهەمبەر کێشەی کوردو ئینسانی کوردا، ئێستاشی لەگەڵدا بێت بەدوای ئەو هەموو گۆڕانە مێژوییەی بەسەر عێراق و ناوچەکەدا هات بەئامادەیی ئەو هەموو میدیایەی کە لەبەردەستی عەرەبەکاندایە، کەچی ئەنفال، ئەو کارەساتە مێژوییە هێندەی ئاوارەبوونی بۆسنییەکان نەبۆتە پرسیارێکی تەنانەت رۆژنامەوانیش لای ئەو میدیا پانوبەرین و بەربڵاوەی بەردەستی عەرەبەکان، بەڵکو بەپێچەوانەوە میدیای عەرەبی بەمەبەست و وەکو درێژکراوەی هەمان دونیابینی شۆڤینی عەرەبی، هەوڵی سیستماتیك دەدەن بۆ نقومکردنی کارەساتی ئەنفال و هەڵەبجە، رۆڵێکی زۆر نێگەتیڤ دەگێڕن لەنیشاندانی وێنەی ئینسانی و مەینەتییەکانی ئینسانی کورددا، رۆڵێکی یەکجار فێڵبازانەو چەواشەکارانە دەگێڕن لەپیشاندانی ئامادەیی کاراکتەری سیاسی و ئینسانی کورد لەناوچەکەداو لەسەنتەری رووداوەکاندا، ئەوەی سەرنجی تەواوی خیتابی میدیای عەرەبی بدات بەمەبەست تاریکی دەخەنەسەر ئامادەیی کورد، بەمەبەست تاریکی

دەخەنەسەر ئەنفال و زیندەبەچاڵکردنی سەدان هەزار هاوڵاتی سڤیل بەدڕندانەترین شێوە، لەدەڤەرێکدا کە زۆر نزیکە لەو میدیایانەوە، ئیدی چۆن چاوەڕێ بین لەرۆژگارێکدا دەنگ لەئەنفالکردنمان هەڵبڕن کە سەدام حسێن سیمبۆڵی ناسیۆنالیزمی عەرەبی و پاڵەوانی خەونە هەڵوەریوەکانی عەرەب و پشتیوانی فەلەستین و زماندرێژو سەرکێشیی هەمبەر ئێرانی عەجەم و ئەمەریکاو جولەکە بوو، ئەو سەرکێشیانەی پڕاوپڕی بەرجەستەی سروشتی ململانێی و رکابەری خێڵەکی بوون زیاتر لەکێشمەکێشمی سیاسیی و جیاوازی ئایدۆلۆژی، ئەو کاریزما کاغەزین و خیتابە خێڵەکییە سەرنجڕاکێشەی رژێم لەلایەك و ئاوەڵاکردنی داهاتی نەوتی عێراق و بەخشینەوەی خێڵەکیانەی داهاتی وڵات بەسەر لەشکری بێشوماری شاعیرو نووسەرو سیاسیی و هونەرمەندو دەسەڵاتدارو مێژونوس و رۆژنامەنوس و سەنتەرەکانی میدیای دونیای عەرەب و کڕینی دەنگ و ویژدانی ئەوانە لەلایەکی دی، دونیای عەرەب رەنگە لەو کۆمەڵگا زۆر تایبەتانە بن کە دەسەڵاتی سیاسیی(بەسروشتی تۆتالیتاری و مشەخۆری خۆشیەوە)شەقامی عەرەبی (بەسروشتی بندەستی و هەژاری و مەینەتیەکانی نادیموکراسی و غەدرەکانی ئەو رژێمانەوە لەسەریان)کەچی ئەو دوهێزە جیاوازە، ئەو دوو بەرژەوەندییە رووبەڕووە کە دێتە سەر دەنگهەڵبڕین لەمەینەتیەکانی ئینسانی کوردی و ئامادەیی ئینسانی و مافەکانی ئەو کۆمەڵگایە، دەسەڵات و شەقام یەك خیتاب و یەك هەڵوێست و یەك خوێندنەوەیان هەیە، زۆر پێش کارەساتی ئەنفال (محمد طالب هلال) لەکتێبەکەیدا دەنوسێت کە نابێت کوردەکان فرسەتیان پێبدرێت



بخوێنن، نابێت بهێڵێن لەناو خۆیاندا ژنوژنخوازی بکەن، بەڵکو ئەگەر هەر نەهێڵێن زەواج بکەن و منداڵ دروستکەن ئەوە زۆر باشترە) ئەمە بەتەواوی سەنتەری دونیابینیەکی وێرانکەرانەی جینۆیسایدکردنە لەهەمبەر کۆمەڵگایەك، ئەم بیرکردنەوەیەی نوسەرێکی عەرەبی سوری هەڵگری سروشتی ئەنفال و تواندنەوەی کۆمەڵگایەکە لەبنەڕەتەوە، نوخبەی عەرەبی ترسنۆکترین و ئینتیهازیترین و شۆڤینیترین نوخبەی خوێندەوارن لەدونیادا کە لەگەرمەی سوتان و هەڵقرچانی پێستی دەیان منداڵی کورد لەئەنفال و هەڵەبجەدا ئێستاشی لەگەڵدا بێت، تەنها (هادی العلوی) لێدەرچێت کەسێك متەقێکی ئازایانە، هەڵوێستێکی ئینسانی دەرنەبڕیوە لەهەمبەر ئەنفالدا، ئەوەندەی ئەو دوو فرۆکەوانە جولەکەیان پێنەکرا کە لەدژی بۆردومانکردنی شوێنە نیشەجێکانی فەلەستینیەکاندا هەڵوێستیان لەسوپای ئیسرائیل وەرگرت و سوپایان بەجێهێشت، خیتابی عەرەبیزم —ئیسلامیزم لەئامادەیی بەهێزی ژێرخانی فەرهەنگی بەداوەت کە سەدام حوسەین بەرجەستەی هەموو ئەمانەبوو پێکەوە نوخبەی رۆشنبیری عەرەبی و شەقامی عەرەب و دەسەڵاتە ئینتیهازیەکانی عەرەبی تا ئەمڕۆکەش لەو کارەساتە بێدەنگکردوە، ئەمانە هەموی فاکتەری زۆر گرنگبوون کە ئەو کارەساتە هەر بێدەنگی لێبکرێت، لەسەر ئاستی ئەوروپاو جیهاندا، بەداخەوە مۆدێلی سیاسەت لەجیهاندا، بەئامادەیی دەزگایەکی گەورەی وەکو نەتەوە یەکگرتوەکانیشەوە، مۆدێلی بەرژەندی نەگۆڕو هەڵوێستی گۆڕاوە، لەکاتێکدا نەوتی عێراق و پارەی عێراق دەچووە گیرفانی زلهێزەکانی دونیاو باشترین کڕیاری چەك

و تەقەمەنی وڵاتانی ئەورووپاو ئەمەریکاو روسیابوو، هەمانکات لەسەنگەری دژ بەئێراندا بەرانبەر ئێرانی ئیسلامی ئێرانێك کە مەترسی بڵاوبونەوەی مۆدێلێکی دەسەڵاتی لێدەکرا کە لەڕۆژئاوادا قەبوڵ نەدەکرا، دەجەنگا، ئەمانە گرنگترین فاکتەربوون کە ئەورووپاو ئەمریکاو روسیا لەئاستی گەورەترین کارەساتی جینۆسایدی سەدەی بیستەمدا هەڵوێستی بێدەنگیەکی بکوژو شەرمهێنەرانە وەربگرن، دەستی سەدام حسێن ئاوەڵاکەن بەدڕندانەترین شێوە، بەئۆپەراسیۆنێکی کەموێنە لەدڕندایەتیدا دەیان هەزار هاوڵاتی سیڤیل زیندەبەچاڵ بکات، بەڵام وەختێك ئاڕاستەی بەرژەوەندییەکان گۆڕاو شەڕی تیرۆرو هەڵکەوتەیەکی مێژویی دەگمەن، کوردو ئەمەریکیەکانی لەسەنگەرێکدا کۆکردەوە، کۆلن پاول وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا لەبەشێکی بەڕێوەچوونی شانۆگەری ئەو سیاسەتەی ئەمریکا ئێستا لەناوچەکەدا پیادەی دەکات و لەبەر کاریگەری پێدراوەکانی ئێستای شەڕی تیرۆرو مۆدێلە تازەکانی کێشمەکێشمی سیاسی لەدونیادا، دوای شازدەساڵ لەکارەساتی هەڵەبجە خۆی گەیاندە ئەو شارە، کە سەردەمانێك لەسایەی بێدەنگی و قڕوقەپی ئەواندا سوتاو هەڵقرچاو بەسەر دانیشتوانەکەیدا وێرانبوو، بەو چەکە کیمیایی و فڕۆکانەی کە بەدۆکیۆمێنت ئاشکران لەوڵاتانی وەکو هۆڵەنداو ئەڵمانیاو ئەمەریکاو روسیاوە رژێم کڕیبوونی، ئەمەیان دیوی مۆراڵی و فاکتەرەکانی بێدەنگبونی دونیا بوو لەو کارەساتەی ئەنفال، بەلەبەرچاوگرتنی ئەو گۆڕانە تەکنەلۆژی و خێرایی پەیوەندی و شۆڕشی گەیاندن کە دەساڵێك دەبێت دونیای بەتەواوی بەهۆی وێنەو شاشەی تەلەفیزۆن و ئینتەرنێت



بەشێوەیەك بچوککردۆتەوە کە رووداوەکان نەك لەساتەوەختی روودانیدا دەکرێت بەتەواوی دونیادا پەخش بێت و هەمووبمان وەکو هاوڵاتی تاقەگەڕەکێك ئاگاداربین لەمسەری دونیا بۆ ئەوسەری، بەڵکو لەهەمووی بەهێزتر بێتوانایی سانسۆرو بێدەسەڵاتی دەوڵەت و هێزە سانسۆرخوازەکانە لەسەر میکانیزمی شاردنەوەو بێدەنگیکردن، ئینتەرنێت و وێنەی تەلەفزیۆن بەهێزترین سیمای بەرجەستەکردنی جیهانگیرییە، دەسەڵاتی وێنەو تەلەفزیۆن و ئینتەرنێت، هەموو خەونێکی سانسۆرخوازانەی دەسەڵاتە تۆتالیتارەکان بۆ شاردنەوەی ناحەزی و رووخساری بێمۆراڵی هەڵسوکەوتەکانیان پوچەڵدەکاتەوە، ئەگەر ئەم توانایانە لەکاتی رودانی ئەنفالەکاندا فەراهەم ببوایە کەم تازۆر رەنگە وەکو کۆڕەوەکە یان جینۆسایدی بۆسنییەکان هەندێکی بکەوتایە بەرچاوی دونیاو میدیای بەئەخلاق و رۆژنامەنوسانی بەئەخلاق دەستیان بگەشتایە وێنەو رژێم و دەسەڵاتە بێمۆراڵەکانیان بخستایە هەڵوێستەوە، ئەوانە هەمووی ئەو فاکتەرانە بوون کە دەیان هەزار ژن و منداڵ و گەنج و پیری لەبێدەنگیدا بەدڕندانەترین شێوازو لەڕەزالەتدا ژیانیان لێسەندرایەوە.

**پرسیار**: ئەو لەهۆشیاریەکی سیاسیی سادەوە کە تەنها لەیادکردنەوەی سەرپێییانەی هۆکارەکانی ئەنفالدا قەتیس بووە، دەگوازرێتەوە بۆ هۆشیاریەکی کەلتوری، لەو بێدەنگیەی کە خاوەنی قسە نییە دەگوازرێتەوە بۆ بیرکردنەوەیەك بەدەنگی بەرز، هەروەها ئەم بێدەنگییە

چەند پەیوەندی بەکورد خۆیەوە هەیە، هەم لەئاستی بەرپرسیارێتی کۆمەڵگای کوردی بۆ ئەنفال و هەم لەئاستی دەسەڵاتی کوردی خۆیدا؟

**دڵسۆز حەمە**: گۆڕینی ئەنفال لەهۆشیاریەکی سادەوە بۆ هۆشیاری سیاسیی لەهەرە گرنگترین ئەو پرۆسانەیە کە لەسەرشانی دەسەڵاتی سیاسیی و نوخبەی رۆشنبیری کۆمەڵگایە بەیەك ئاڕاستەی میژویی و سیاسی کە ئەویش بەرهەمهێنانی هۆشیاریەکی سیاسیی و ئینسانیی قوڵی ئینسانی کوردو کۆمەڵگای کوردییە بەشوناسی ئەو کارەساتەو بەکارهێنانی ئەو تراژیدیاو تراژیدیا هاوشێوەکانی تریش لەپێناو بەرهەمهێنانی بەهایەکی بەرزتر، مانایەکی قوڵتر بۆ نرخی مرۆڤ و مافەکانی مرۆڤ و کەرامەتی مرۆڤ هەمانکات بەکارهێنانی سیاسی و ئینسانی ئەو کارەساتانە لەمساتەوەختەی کە قۆناغی بەدەستهێنانی دەوڵەت و کۆمەڵگای ئێمە هەنگاوێك لەملای تراومای ئەنفالەوەیەو لەهەلومەرجێکی جیۆپۆلەتیکی ئێجگار دەگمەن و ئاڵۆز، بەڵام ئایا کۆمەڵگای کوردی و دەسەڵاتی کوردی بەو ئاستە کۆڵەوارەی هۆشیارییەوە دەتوانن بەو ئاڕاستەیاندا کاربکەن؟ سەرنجراکێشترین رستەیەك لەکتێبی (دلڕەقی و بێدەنگی) کەنعان مەکیەدا، بەرچاوم کەوت، زۆر شایانی لەسەر وەستان و بیرکردنەوەیە، وەختێك (تەیمور) پاڵەوانی موقەددەسی ناو گۆڕە بەکۆمەڵەکان باسی دواچرکەکانی رووبەڕووبوونەوی حەشاماتێکی زۆر دەکات کە لەگۆڕەکەدا دانیشتون و چاوەڕێی دەسرێژکردن و هەڵوەرینی خۆیان دەکەن، کە زۆربەیان ژن و منداڵن،



تەیمور دەڵێت: (کەس دەنگێکی لێوە نەهات)، نووسەر چەند جارێك دەیەوێت بزانێت کاردانەوەی ئەو هەموو ژن و منداڵە کە یەکێکی تەنیشتی تەیمور خۆی ژنێکە بەکۆشێك منداڵەوە لەساتەوەختی ئاودیوکردنیاندا بۆ مەرگێکی پڕ لەڕەزالەت و ئیدی دواساتەکانی ئەو کوژانەوەیە چۆن بووە، بەڵام تەیمور دووبارەی دەکاتەوە کە زۆر لەبێدەنگییەکی ئازاراویدا روویداوە هەر وەکو ئەوەی ئەوانە دەمێك بێت مردبن، لەڕاستیدا (بێدەنگی) لەمێژوی ئێمەدا ئامادەییەکی تەواو فراوان و کوشندەی هەیە، (بێدەنگی) بۆتە دیاردەیەکی ئازاراوی و شەرمهێنەر بەتەواوی مێژووی ئێمەوە، کە ئیدی لەئۆپەراسیۆنی ئەنفالدا دەگاتە لوتکەو لەئاستی ترسناکیی و نامرۆڤانەیی ئەو هاوارە ئینسانییەی کە کارەساتێکی وەها هەڵیدەگرێت، ئیدی بێدەنگی دەچێتە ژێر پرسیارەو چیدی بەرگەی ئەو قورساییە ئینسانییە ناگرێت کە کارەساتێکی وەها لەسەر ویژدانی سیاسی و ئەخلاقیمان دایدەنێت، کۆمەڵگای ئێمە لەپێش ئەنفال و دوای ئەنفالیش کۆمەڵگایەکە (بێدەنگی)بە دوو ئاڕاستە کاریکردووە لەسەر چەپاندنی هێزی قسەکردن و توانای دەرخستنی مەینەتیەکانی، ئاڕاستەیەکی ناوەکی کە کۆمەڵگای کورد خۆی لێی بەرپرسیارە بەتەواوی پێکهاتە فەرهەنگی و سیاسی و رۆشنبیری و ئایینیەکانەوە، ئاڕاستەیەکی دەرەکیش کە لەدوژمنە داگیرکەرەکانەوە دەستپێدەکات تا دەگاتە ئەو سیستمە سیاسییەی دونیا بەرێوەدەبات لەڕەهەندێکی دوورتردا، جگە لەوەی کۆمەڵگای ئێمە وەکو زۆرێك لەکۆمەڵگا سەرکوتکەرە چەپێنەرەکان لەسەر تەقدیسکردنی بێدەنگی و بێبەهاکردنی

گوزارشتکردن و قسەکردن خۆی بیناکردوە، کۆمەڵگایەکە گرفتی گەورەی هەیە لەگەڵ گوزارشتکردن و گێڕانەوەی خۆی و حیکایەتەکانیدا، لەکاتێکدا خاوەنی مێژویەکە لەفرمێسك و خوێن و ژیان لەتەنیشت مەرگەوە، خاوەنی درێژترین حیکایەتی چەوساندنەوەو ئازارو مەینەتی ئینسانییە، کە بەدیوێکی تریشدا رەنگە ئەو واقیعە مێژووییەی بۆ خۆشی فاکتەرێك بێت لەپاڵ فاکتەرەکانی تردا بۆ کەمکردنەوەی توانایی گوزارشت و دەنگهەڵبڕین لەمێژووی ئینسانی کوردا، وەختێك دەڵێین بیرکردنەوە بەدەنگی بەرز مانای ئامادەیی هۆشیاریەکی قوڵ و فراوان کە هەڵوێستی مێژوویی و سیاسیی بەرهەمدێنێت، کۆمەڵگای ئێمە لانیکەم لەئێستادا خاوەنی ئەو هۆشیارییە سیاسیی و فەرهەنگییە نییە، هەستکردن بەمەینەتییەکان و بینینی کارەسات و ژیان لەچەوساندنەوەدا بەتەنها هۆشیاری سیاسی بەرهەم ناهێنێت، (هەستکردن) وەکو پرۆسەیەکی فیزیکی و رۆحی مرۆڤ لەژیانداو لەهەمبەر رووداوەکاندا مانای بەرهەمهێنانی هۆشیاری نییە، هەمانکات کارکردن لەسەر هەست و سۆزو لاوانەوەو کوڕوزانەوەو کارکردن لەسەر جوڵانی سۆزو هەستی خەڵك و نیشاندانی وێنەی هەستبزوێن بەتەنها مانای بەرهەمهێنانی هۆشیاری و سازدانی خەڵك نییە بۆ پرۆسەیەکی میژویی گرنگ کە بەرهەمی سیاسیی وئینسانی و یاسایی لێبکەوێتەوە، وەکو ئەو دۆخەی ئێستا دەسەڵاتی کوردی و میدیای کوردی بەرخوردی پێدەکات لەگەڵ رووداوی ئەنفالدا، یادکردنەوەی سالانە بەو شێوازە میکانیکی و سەرپێیی و ریکلامئامێزەی کە سالانە چەند رۆژێك میدیاکان خۆیانی پێوەسەرقاڵ دەکەن و ئیدی



تەواو دەبێت نەك هۆشیاریەکی سیاسی و ئینسانی بەرهەمناهێنێت بەڵکو تەنانەت بەرجەستەی حورمەتی قوربانییەکان سەنگ و قورسایی ئەو کارەساتە ناکات، بەڵکو کاریگەری نیگەتیفیشی هەیە لەسەریان ئەوەتا لەیادکردنەوەی ئەم سالانەی رابردوودا خاوەنی راستەقینەی حیکایەتەکان نەك ئامادەیی بەشداری ئەو مەراسیم و یادکردنەوە بێرۆح و میکانیکیانە ناکەن، بەڵکو هەڕەشەی خۆپیشاندان و بەشدارینەکردن دەکەن، ئەمانە بەڵگەی بێهودەیی و بێکەڵکی ئەو شێوازەی بەرخوردی دەسەڵاتی ئێمەیە لەگەڵ ئەنفالدا، کە خەرجی و مەسرەفێکی زۆر بێهودە لەجێگایەکدا سەرفدەکرێت و بەفیڕۆدەچێت کە هیچ بەرهەمێکی نییە جگە لەگەندەڵیی خەرجکردن و بەجێگەیاندنی واجبێکی حزبی و رێکخراوەیی، لەکاتێکدا ئەو رووداوە لەپێودانگی تەمەنی مێژوییەوە رووداوێکی تازەیەو زۆر بەگەرمی ئامادەیە، قوربانییەکان هێشتا لەژیاندا ئامادەن و حیکایەتەکانیان لەگەڵ خۆیاندا دەگێڕن، کەچی دەسەڵات و میدیاکانی ئەو دەسەڵاتەو زۆر لایەنی دی لەدووری خاوەنی راستەقینەی ئازارەکە، لەدەرەوەی جوگرافیای رۆحی کارەساتەکە خۆیان قسەدەکەن و مۆدێلێکی گوزارشت و دەنگهەڵبڕین پێشکەشدەکەن، کە هێندە سواوە کە خاوەنی راستەوخۆی حیکایەتەکان بەدەنگی خۆیانی نازانن و بگرە لەو مەراسیمانەش بێزار و توڕەبوون، لەلایەکی ترەوە ئەگەر سەرنج بدەینە تەواوی وێنەکە ئەوەی خۆپیشان سازدەکات، ئەوەی دەنگێك لەهەلومەرجی ژیانی پاشماوەی شەهیدانی ئەنفال هەڵدەبڕیت، لەزۆربەی حالڵدا خۆیانن بەتەنها، لەکاتێکدا لەئامادەیی هۆشیاری سیاسیدا ئەم

ئامرازانە ئاستێکی بەرزترو فراوانتری دەگرت، مەتڵەبی ئەنفالەکان تەنها ئەو کۆمەڵە کەسە نییە، بەڵکو مەتڵەبی تەواوی کۆمەڵگای کوردییە بۆ ئەنفالەکان، بەرهەمهێنانی هۆشیاری سیاسی مانای گوێزانەوەی مەسەلەی ئەنفال و حیکایەتەکانی ئەنفال و چەقی قورسایی مێژوویی و ئینسانیی ئەنفال لەناوەندی رووداوێکی تراژیدییەوە بۆ پرسێکی سیاسی هەمیشە ئامادە، لەحیکایەتی کۆمەڵێك قوربانی راستەوخۆی کارەساتەکە بۆ حیکایەتی سەرجەم ئینسانی کوردو یەکێك لەو پایەو پێدراوە گرنگانەی کە گەواهی تراژیدیاو ئەو زوڵمە مێژووییانەیە کەبەر مرۆڤی کورد کەوتووە، لەکاتێکدا ئەگەر ئێمەی کورد پرۆژەی ئازادیی و دەوڵەتی سەربەخۆمان هەبێت، (هۆلۆکۆست) یەکێك لەو پایە مێژوویی و گرنگانەیە کە جولەکە نەك هەر لەدامەزراندنی دەوڵەتی ئیسرائیلدا کەڵکی لێوەرگرت، بەڵکو لەو حیکایەتە مێژووییانەیە تا هەنوکە لەمەیدانە سیاسی و دبلۆماسی و زانستی و نێودەوڵەتیەکاندا بەکاری دێنێت و کەڵکی لێوەردەگرێت، بەرهەمهێنانی هۆشیاری سیاسی بەمانای گوێزانەوەی قسەکردن لەسەر ئەنفال و ئاسەوارو رەهەندە ئینسانی و مێژوویی و فیزیکەکانی، لەکوروزانەوەو لاوانەوەوە بۆ ئاستێکی یاسایی و سیاسی، چی لەسەر ئاستی کۆمەڵگای کوردی چی لەسەر ئاستی دەرەوەی کۆمەڵگای کوردی، بەمانای دەسەڵاتی کوردی دەتوانێت لەسۆنگەی تراژیدیایەکی وەکو ئەنفالەوە داوای زەمانەتی یاسایی بکات چی لەحکومەتی ناوەندی، چی لەکۆمەڵگای نێودەوڵەتی، بەیەکێتی ئەوروپاو نەتەوە یەکگرتوەکانیشەوە، هۆشیاری یاسایی کە لەو مەسەلە زۆر گرنگانەیە کە دەسەڵاتی کوردی



دەتوانێت کاری لەسەر بکات، دونیا لەو کارەساتە هۆشیار بکاتەوە کە لەدوێنێدا روویانداوەو حیکایەتەکان هێشتا بەردەوامن.

ئامادەیی کەلتوری تەقدیسکردنی بێدەنگی و چەپاندن لەسایکۆلۆژی دەستەجەمعیماندا کاریگەری بەرچاوی هەیە تەنانەت لەئەمرازەکانی گوزارشتکردن لەتورەیی و مەینەتی و تراژیدیا مێژووییەکانی وەکو ئەنفالدا کە پێدەچێت وایکردبێت ئەنفال تەنها بەمەسەلەی ئەو لادێنشێنانە دابنێت کە پاکتاوکران و پاشماوەیەکی زۆر قوربانییان لەپاش بەجێماوە، تەنها بەحیکایەتی تایبەتی ئەو ژنە رەشپۆشانە دابنێت کە نیوەیان لەمەرگداو نیوەیان لەژیاندا بەجێماوە، بەبڕوای من ئەمەیان ترسناکە کە هۆشیاری سیاسیی کۆمەڵگای کوردی تووشی هاتووە، دەبێت ئەم بازنەی پێکەوەگرێدان و هەستی مەینەتی و ئازارەکان، خۆبەخاوەنزانینی تراژیدیاکە لەناوەندی قوربانیانی راستەوخۆوە کە (بەشێکی جەستەی نەتەوەیی ئێمەیە) بگوێزرێتەوە بۆ خۆبەخاوەنزانین و پێکەوەگرێدانی هەر تاکێکی کۆمەڵگا، ئەویش لە بەبەکارهێنانی ئەنفال وەکو بەشێك لەناسنامەی نەتەوایەتی ئینسانی هەرتاکێکی کورد لەڕێگای بەکارهێنانی یاسایی و سیبمبۆلی ئەنفال لەپرۆژە ستراتیژییەکانی وەکو دامەزراندنی دەوڵەت و سەقامگیرکردنی دیموکراسی، کە ئەم دەسکەوتانە، ئەم پرۆژانە هەموو تاکەکەن لەخۆدەگرێت لەئاستی وڵات نەتەوەدا.

گوێزانەوەی مەراسیم و یادکردنەوەی سواوی ساڵانەی ئەنفال، راگرتنی مایکرۆفۆنە خەواڵوەکان بۆ ئاستێکی جدیتر لەکارکردن بەئاراستەی خوێندنەوەی ئەنفال و بەرهەمهێنانی هۆشیاریی،

دروستکردنی هەر پرۆژەیەکی مێژویی و سیاسی بەئاڕاستەی بەرهەمهێنانی هۆشیارییەکی تایبەتی کۆمەڵگا، هەمیشە پەروەردەو زانکۆکان رۆڵی گرنگیان هەبووە لەفۆرمۆلەکردنی هەستی دەستەجەمعی خەڵکدا، خوێندنی ئەنفال وەکو مێژوو، وەکو شوناسێکی تراژیدی کۆمەڵگایەك، وەکو بەشێك لەحیکایەتی بەرەنگابوونەوەو تێکۆشان و کێشمەکێشمی مرۆڤی کورد لەپێناو ئازادیی و سەربەخۆییدا، خوێندنی ئەنفال وەکو ماددەیەکی مێژوویی و کۆمەڵایەتی لەخوێندنگەکاندا، کردنەوەی دەرگای لێکۆڵینەوەو سەنتەری لێکۆڵینەوە لەزانکۆکان و تیۆریزەکردنی ئەنفال و خوێندنەوەی ئەو مێژووە بەتیۆرە زانستییەکان و شرۆڤەکردنی ئەکادیمی ئەنفال لەهەموو دیوە مێژوویی و ئینسانی و جوگرافی و فیزیکی و ئایدیۆلۆژی و هەردیوێکی تری خوێندنەوەکان، ئەمانە هەموو ئەو ئامرازانەن، ئەو رێگایانەن کە دەکرێت بەکاربهێنرێن بۆ بەرهەمهێنانی دیدو هۆشیاریی لەهەمبەر هەرپرسێکی مێژوویی و زیندوودا.

دەسەڵاتی کوردی نەك پێناچێت خاوەنی هۆشیارییەکی سیاسی بێت لەهەمبەر ئەنفالدا، بەڵکو وەکو بەرپرسیارییەکی ئەخلاقیش هەڵگری هیچ خەمێکی سیاسیی و ئینسانی و مێژووییش نییە، ئەمڕۆ ئەنفال و قوربانییەکانی لەبەکارهێنانی سیاسیی حیزبیانە بەولاوە گرنگی سیاسی و ئینسانی نییە، ئەم بەکارهێنانە سیاسییە حیزبییە وا دەکات، کە لێپرسراوێکی گەورەو بەدەسەڵاتی حیزبێك لەبەر خاتری راکێشانی عەرەبە سونەکان پاکانە بۆ تاوانبارێکی ترسناکی وەکو سوڵتان هاشم بکات، کە خۆی بە شانازییەوە لەدادگاییەکاندا دان دەنێت بەسەرکردایەتیکردنی



راستەوخۆی لەئۆپەراسیۆنەکانی ئەنفالدا، کەچی ئەو سەرکردە کوردە لەگەمەیەکی سیاسیدا، پێدەنێتە کەرامەت و ویژدانی برینداری کۆمەڵگایەکدا کە ئەنفالی بەرامنەر کراوەو پاکانە بۆ تاوانبارە سەرەکیەکە دەکات، خۆ درامای هۆڵی دادگایی تاوانبارانی ئەنفال، ئەو دادگاییە مێژووییەی کە بەبڕوای من بۆ کۆمەڵگایەکی هەمیشە پەراوێزخراوی وەکو کۆمەڵگای ئێمە ئەو داداگاییکردنە، تەنها دادگایی تاوانێك نەبوو، بەڵکو دەسکەوتێك بوو بەپانتایی مێژووی کۆکوژیی و سووتان و ویرانبوونی فیزیکی و رۆحی ئینسانی کورد، کەچی ئەو دەسەڵاتە بێخەم و بێباکە لەمشوری دابینکردنی پێویستیە تەکنیکیەکانی وەکو وەرگێڕو پارێزەرو تەنانەت ئامادەکردنی ئەو شایەتحاڵە سادەو ساویلکانەشدا نەبوو، کە رەنگە هەر ئیجرائاتی داخڵبوونی ناوچەی سەوز تووشی شۆکی کردبن، درامای ئەو دادگاییەو بێباکیی دەسەڵات لەبەڕێوەچوون و پێدانەگرتنی تەنانەت لەجێبەجێکردنی ئەو بڕیارانەی کە داداگا لەهەمبەر کەیسی ئەنفالدا بڕیاریدا، بۆ نموونە مانەوەی عەلی کیمیایی لەژیاندا کە ئەوە ساڵێك دەبێت بڕیاری سێدارەدانی دەرچووە، دەسەڵاتێك بەو هۆشیاریی و بەو بێباکی و خەمساردییەوە لەگەڵ گرنگترین دادگایی مێژوویی داوی دادگایی نورمبرغ، هەڵسوکەوت بکات، ئیدی چۆن دەتوانین قسە لەسەر بەرهەمهێنانی هۆشیاریی سیاسیی و کەلتوری بکەین؟

لەکاتێکدا دەسەڵاتی کوردی و ئەو ئیدارە خۆماڵیە لەئێستادا خاوەنی سەرمایەی ئابوری و توانای ئابوری بەهێز و ترسناکە، لەقۆناغی دەوڵەمەندبوون و خۆگرتنی خۆیدا گرێبەستی نەوت دەبەستێ و هەوڵی

ئیستیسماری مەزن دەدات و لەوپەڕی سەرسامی بەسەرمایەو دەسکەوتەکانیدا یە، ئاستی ئینسانی و گوزەرانی ژیانی پاشماوەی ئەنفالەکان کە هەلومەرجێکی کۆمەڵایەتی و دەروونیی و ئینسانی زۆر خراپدا دەژین و بگرە کەوتوونەتە پەراوێزی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئینسانی کۆمەڵگای ئێمە، زۆرێك لەئەنفالچی و تاوانبارانی ئەو کارەساتە ئەمڕۆ لەکوردستاندا گوزەرانیان و پێگەی سیاسییان هەر بەراود ناکرێت لەگەڵ بەجێماوی ئەنفالەکاندا، لەلایەکی دیەوە کە بەبڕوای من سەرەڕای نیشانەی گەندەڵیی و نا بەرپرسیاربوونی دەسەڵات، هەمانکات نیشانەی نزمی ئاستی هۆشیاری سیاسی و ئینسانی کۆمەڵگای ئێمەن لەهەمبەر تراژیدیاکانی خۆیدا، ئەنفال و کۆکوژیی ئەوان و زیندەبەچاڵکردنی هەزاران ژن و منداڵ کێشەیەکی سیاسی تایبەت بەو گوندنشینانە نییە، هێندەی ئایدیۆلۆژیەکی شۆڤینی و پرۆژەی سەرکوتکردنی بزوتنەوەی رزگاریخوازی نەتەوەیەك و جینۆسایدکردنی مرۆڤی کوردی لەپشتەوە بوو، ئیدی ئەو مرۆڤە کوردانە لەو هێرشەدا ئەوان بوون، ئەمەیە سەنتەری بیرۆکەی خۆبەخاوەنزانینی رووداوەکە لەلایەن هەر تاکێکی کوردەوە کە وادەکات، ئەوە هەر ژنە رەشپۆشەکان خۆیان بەرپرسیار نەبن، کە تورەبن و خۆپیشاندان سازبکەن و ناڕەزایی لەخراپی گوزەرانیان دەربڕن، بەڵکو، هەر تاکێك دەبێت بەشداری ئەو فشارە بێت کە هەر ژنێکی ئەنفاك دەخوازێت بیخاتە سەر دەسەڵات و دامودەزگاکانی، هەرتاکێك لەدکتۆرو ئەندازیارو مامۆستاکانەوە تا پێڵاوە فرۆش و رۆژنامەفرۆش و دوکاندارەکان، ئەوە ئەو ئاستی هۆشیارییە پێویستەیە کە دەبێت



بەرهەمبێت. بەکارکردنی زانستی و جددی لەجومگە پێکهاتەکانی دەزگای دەوڵەتدا فەراهەمدەبێت، کە ئەرکی دەسەڵاتی کوردییە.

لەدەوڵەتی ئیسرائیلدا کە لەسەروبەندی (هۆلۆکۆست)دا خۆیان بەکۆمەڵگایەکی بەر تراوماکەوتوو دەزانن گەورەترین سەنتەری زانستی و پزیشکی بۆ چارەسەری دەرونیی و بووژاندنەوەی رۆحی و دەرونیی مرۆڤ بەنوێترین میتۆدەکان دامەزراوە بۆ یارمەتیدانی هەر نەخۆشێك کە لەڕووی دەرونییەوە دەڕوخێت و دەگاتە دارمانی رۆحی وەکو هەرتاکێکی ئەنفالەکانی ئێمە، هۆشیاری بەهۆلۆکۆست و دەرئەنجامە دەرونیی و ئینسانییەکان پرۆژەی وەهای لەئیسرائیلدا کردۆتەوە، لەکاتێکدا زۆربەی بەجێماوی ئەنفالەکان لەجێگای نیشتەجێبوون و خزمەتگوزاری تەندروستی و ئاوی پاکی خواردنەوە بێبەشن، ئیدی ژیانەوەی دەرونی و کۆمەکی رۆحی لەو مەسەلانەن کە هێشتا بایەخیان پێنەدراوە.

**پرسیار**:ئەو پێشنیازە تایبەتیانەی ئێوە چین بۆ ئەوەی ئەنفال وەك کارەساتێکی مێژوویی لەیادەوەری ئینسانی کوردا بەچەشنێك بمێنێتەوە کە هەمیشە جێی ئاوڕدانەوەو قسەکردن بێت لەسەری لەلایەن ئەو نەوانەی کە لەدواڕۆژی کۆمەڵگای ئێمەدان؟

**دڵسۆز حەمە**: بێگومان هەر بەبەرهەمهێنانی هۆشیاریی سیاسی لەکۆمەڵگای کوردیدا دەتوانین ئەنفال وەکو یادەوەرییەکی زیندوو لەژیانی نەوەکانی داهاتوودا بهێڵینەوە، ئەمەش بەو ئامرازانە بەرهەمدێت کە باسمانکرد، بەڵام ئەو ئامرازانە چۆن بەرهەمدێت، بەرهەمهێنانی

هۆشیاریی لەکۆمەڵگایەکدا لەهەمبەر هەر ڕووداوێکی مێژوویی دەوڵەت و دەزگا ئەکادیمی و سەنتەرە زانستی و پەروەردەییەکان دەتوانن بەرهەمی بێنن، ئەمانە لەکوردستاندا هیچیان لەهەمبەر کارەساتی ئەنفالدا فەراهەم نەکراوە، ئەنفال ڕووداوێکە کە دەتوانم بڵێم هێشتا لەحیکایەت و گێڕانەوەدایەو نەکراوەتە پرۆژەی خوێندنەوەو تیۆریزەکردن، کارەساتێکە هێشتا ئێمە لەقەبووڵکردن و تەماشاکردنێکی بێدەسەڵاتانەی کارەساتەکەدا دەژین و قوربانییەکان ماسۆشیانە دەلاوێنینەوە بێئەوەی یارمەتیان بدەین یان تەنانەت هۆشیاریمان هێندە فراوان بێت، هەستکردنمانی هێندە قوڵ و تیژ بێت تووشی شۆکمان کات، بەدەنگی بەرز هاوار بکەین، ئەنفال لەهۆشیاری ئێمەدا هێشتا نەچۆتە قۆناغی هاوارو دەنگهەڵبڕینەوە، ، هێشتا ئەنفال لەوەدەکات سونامیەکی سروشتی لادێکانی لەدەستدابن و بەمووچەیەکی سواڵکەرانەو یارمەتییەکی سەرپێی لەکۆڵی دەوڵەت بچنەوە لەکاتێکدا، ئەنفال دەستکردی سروشت نییە، بەڵکو داپڵۆسینی کەرامەت و هەست و ژیان و بوونی کۆمەڵگایەك بوو تا ناخی ناخ، هەڵکێشان و سووتانی مرۆڤەکان بوو هەر بەسەوزی، لەکاتێکدا ئەنفال هەڵقرچانی ڕۆحی هەزاران مرۆڤ بوون لەبێدەنگیی و تەنهاییەکی بکوژداو بەدڵڕەقترین مەرگ و کارەسات، لەکاتێکدا ئەنفال ڕووخانی تەواوی وەهمەکانی ئەخلاق و ویژدان و ئینسانییەت و خستنە ژێر پرسیاری تەواوی ئەخلاقی سیاسی بوو لەدونیادا بەئەخلاقی نیشتیمانی و ناسیۆنالیستی و تەنانەت ئایینی و کۆمەڵایەتی خۆشمانەوە ئیدی چۆن کەسێك هەڵگری ئازارێکی وەها قوڵ و برینێکی وەها ئینسانی و مێژوویی





بێت، بەمووچەیەکی سواڵکەرانەی وەزارەتی (ئەنفال و شەهیدەکان) کێشەکەی دەبڕێتەوە، بەبڕوای من هێشتنەوەی کارەساتێکی وەها لەیادەوەری ئینسانی ئێمەدا کە بۆ خۆی ئامادەیی بیرچوونەوەی زۆرترە وەك لەهەڵگرتن لەیادەوەریدا، جگە لەبەکارهێنانی سیاسی و یاسایی ئەنفال لەپرۆژە سیاسی و ستراتیژییەکاندا، هەمانکات وەکو ئامادەییەکی ماتریالیش گرنگە، دۆکیۆمێنتکردنی ئەنفالەکان لەو پرۆژە زۆر گرنگانەیە کە دەبێت کاری بۆ بکرێت، بەتایبەت ئەو کەسانەی کە هێشتا لەژیاندا ماون و باشترین شایەتحاڵی مێژوویەکن کە گرنگییەکی جیهانیشی هەیە لەقۆناغەکانی داهاتوودا، دۆکیۆمێنتکردنی زانستی ئەنفال بۆ ئێمەی کورد لەو ئامرازانەیە کە مێژووی کارەساتەکە بەزیندوویی دەهێڵێتەوە هەمانکات بۆ هەر پرۆژەیەکی سیاسی دەتوانرێت کەڵکی هەبێت بەتایبەتی لەسەردەمێکداین سەردەمی لالآنەوەو پاڕانەوە نییە، بەڵکو سەردەمی میدیاو دۆکیۆمێنت و ئەرجومێنتە، کردنەوەی سەنتەری زانستی و ئەکادیمی بۆ لێکۆڵینەوەو شرۆڤەکردنی ئەنفال و ڕوگە جیاوازەکانی، سەنتەرێك وەکو سەنتەری (هۆلۆکۆست)، کە دەتوانێت لەسەر ئاستە ئەکادیمی و نێودەوڵەتی و یاساییەکان ڕۆڵی زۆر گرنگ ببینێت، هەمانکات ناوەندێکی زیندووبێت بۆ هەمیشە بەرهەمهێنانی خوێندنەوەی نوێ و ئاوڕدانەوەی هەمیشەیی کە بێگومان نەوەی نوێ دەتوانێت بەرهەمی بهێنێت. ئامادەیی ئەنفال وەکو بەشێك لەیادەوەری مێژوویی ئێمە وەکو لەپرسیاری پێشوودا باسم کرد بەشێکی گرنگی دەکەوێتە سەر دەزگاکانی پەروەردەو پێگەیاندن، خوێندنی ئەنفال لەقۆناغە جیاوازەکانی

خوێندندا، کردنەوەی بەشی تایبەت لەزانکۆکاندا بۆ لێکۆڵینەوەو بەدواداچوون چی بۆ قوتابی کورد یان غەیرەکورد، جگە لەمۆزەخانەو کتێبخانەو مۆزەخانەی دۆکیۆمێنت و بەرهەمهێنانی کتێب و بڵاوکراوە کە بۆ تەمەنە جیاوازەکان دەستبدات.

میدیا لەو ناوەندە زۆر گرنگ و هەستیارانەیە کە ئەمڕۆ پانتایی دەسەڵات کاریگەری لەوپەڕی فراوانیدایە، بگرە لەوڵاتە دیموکراتەکاندا ئەوە میدیایە کە دەتوانێت کاریگەری لەسەر هەندێك رووداو وەها دابنێت کە حکومەت هەڵوەشێنێت و کاریگەری لەسەر رووداوەکان دابنێت، بەڵکو لەوڵاتانی دیموکراتدا کە میدیای ئازادبوونی هەیە، دەسەڵات لەژێر رەحمەتی میدیادایە، بەتایبەتی تۆڕەکانی ئینتەرنێت، سینەماو تەلەفزیۆن، جولەکە زۆر زیرەکانە توانیویەتی کەڵك لەو ئامرازە وەربگرێت، رۆژێك تێناپەڕێت ئەگەر لەسوچێك لەسوچەکانی ئەو سەدان هەزار میدیایانەی بەدونیادا بڵاوبوونەتەوە فیلمێك، رێپۆرتاژێك، باسێك لەسەر هۆلۆکۆست نیشان نەدرێت، جولەکە دەیان فیلمی بەهێزی لەسەر (هۆلۆکۆست) لەهۆلیودا بەرهەمهێناوە کە کاریگەری زۆر گرنگی نەك لەسەر یادەوەریی نەوەکانی جولەکە، بەڵکو لەسەر جیهانیش داناوە، بەکارهێنانی میدیا لەدەرەوەو لەناوەوەی کوردستان لەو ئامڕازە گرنگانەیە کە دەتوانێت مێژووی ئەنفال بەزیندوویی رابگرێت.



**پرسیار:** ئایا ئەدەبی کوردی بەتەعریفە جیاوازەکانی ئێوەوە بۆ ئەدەب، چەند بەرپرسیارە لەبەردەم بیرنەکردنەوەدا لەئەنفال؟

**دڵسۆز حەمە**: وەختێ باس لەپرسی ئەدەب و ئەنفال یان بەرپرسیاری ئەدەب لەبیرنەکردنەوە لەئەنفال دەکرێت بەبڕوای من مانای قسەکردنە لەدوو ئاڕاستەی ئەدەب، یەکێکیان بەئاڕاستەی بەرهەمهێنانی تێکستی هونەری، تێکستێك کە بەرجەستەی ئەو هاوارە مێژووییە، ئەو ئازارە ئینسانییە ئێجگار قوڵ و گەورەیە بکات، تێکستێك بەپانتایی گۆڕەکان و قوڵایی ئەو برینی سووتان و کاولکارییە دەرونیی و فیزیکیەی بەجەستەی کۆمەڵگای ئەنفالکراودا قوڵبۆتەوە خوارێ، ئاڕاستەی دووەمیشیان قسەکردنە لەسەر بەرهەمهێنانی مەعریفەیە، مەعریفەیەك کە پرسیاری زانستی بەرهەمبێنێت لەسەر ئەنفال، وەکو پرۆسەیەك، کارەساتێك لەمێژوودا، بۆچی؟، چۆن؟ بۆ بەو شێوازانە پیادەکرا؟؟ بەرئەنجامی شەڕی ناوخۆی هێزە جیاوازەکانی ناو عێراق بوو یان پیادەکردنی ئایدیۆلۆژی شۆڤینیزمی عەرەبی؟ ئەنفال بەشێکە لەشێتی و بەربادییەکانی عەقڵی بەشەری یان ئۆپەراسیۆنێکی سەربازیی ئەپستراکت؟ کێن ئەوانەی دەتوانن منداڵ و ژنانێك زیندەبەچاڵ بکەن کە نایانناسن؟ ئەو سایکۆلۆژییەتە بەربەری و بێڕۆحە لەکوێوە سەرچاوەی گرتووە؟ چۆن ئەنفال دووبارە نابێتەوە؟ ئەنفال و سایکۆلۆژیای کۆمەڵگای کوردی؟ ئەنفال و فیکری ئیسلام؟؟ ئەنفال و ئەگەرەکانی دووبارەبوونەوەی؟ ئەنفال و ئەگەری ئامادەیی ئەنفال لەئایدۆلۆژی و

جیهانبینی هێزە جیاوازەکاندا؟ ئەنفال و ئەخلاقی سیاسی نێودەوڵەتی؟ بەکارهێنانە ڕەمزیی و سیاسییەکانی ئەنفال؟ و دەیان و هەزاران خوێندنەوەو پرسیارو بواری شرۆڤەکردن و بیرکردنەوە لەو کارەساتە گەورەیە، کە بۆ خۆی ئەم پرۆژەیەی (بێدەنگیی و کۆکوژی) ڕەنگە هەوڵێك بێت لەکارکردنی ئەدەب بەئاڕاستەی دووەمدا، کە ئاڕاستەی شرۆڤەو بیرکردنەوەو بەرهەمهێنانی پرسیارە، لەڕاستیدا ئەم ئاڕاستەیەیان نەك هەر بەرپرسیارە لەبیرنەکردنەوە لەئەنفال، بەڵکو بەرپرسیاریشە لەو نەهامەتییە ئینسانی و ئەو بێباکیەی حکومەت و دەسەڵاتی سیاسی لەهەمبەر بەجێماوەکانی ئەنفال و کێسی ئەنفالدا پیادەی دەکات، ئەدەبی کوردی لەهەموو بوونیادە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئایینی و ئایدیۆلۆژەکانی تر، لەهەموو دەزگاو دامەزراوە ماتریالیەکانی دی زیاتر قسەی لەسەر ئەنفال هەبووەو ئەنفالی لەخۆدا هێشتۆتەوە، نووسەرێك، شاعیرێك، ڕۆژنامەنووس و ڕۆماننووسێکمان نییە لەسەر ئەنفال بەدەنگ نەهاتبێت، لەسەر ئەنفالی نەنووسیبێت، ئامادەیی ئەنفال لەدونیای ئەدەبیماندا ئامادەییەکی زیندووە، بەڵام تاچەند ئەنفال بۆتە دەقێکی داهێنەرانە، تاچەند کاری گەورەی لەسەرکراوە کە بگاتە ئاستی ژمارەی ئەو دەقانەی کە لەسەر هۆلۆکۆست و مەنفاکانی سیبریاو شۆڕشی فەرەنساو شەڕی ڤێتنام و قەتل و عامەکانی پۆل پۆت و مەینەتییەکانی جەنگی یەکەم و دووەمی جیهانیی و هەموو ئەو مەینەتییە ئینسانییە مێژووییانەی هاوشێوەی ئەنفالن تا دەگاتە دەقێکی وەها ئەو کارەساتە بکاتە دەقێکی قسەکەر، تێکستێك کە توانای دەنگهەڵبڕین و



گوزارشتکردنی هەبێت، ئەوا دەبێت بشپرسین چەند نووسەری گەورەمان هەن کە لەقەدەر داهێنانی بەو ئاستەدا بن؟، چەند بەختیار عەلی و چەند شێرکۆ بێکەس و چەند عەتای نەهاییمان هەیە؟ دواتر پێموایە ئیدی ئێستا سەرەتای ئەو فاسیلە مێژووییە بێت کە ئیدی تێکست و نووسین بتوانێت تەماشای ئەو کارەساتە بکات و لەڕووداو و وێنەکانی قوڵبێتەوە بەهەموو ڕەهەندە مێژوویی و ئینسانی و تەنانەت نەتەوەیی و تەواوی ئەو ڕەهەندە زۆرو چڕو ئاڵۆزانەی کە تراژیدیایەکی وا دەتوانێت بەدونیای تێکستێکی ببەخشێت، ئەدەبی ئێمە چی لەڕووی بەرهەمهێنانی تێکست چی وەکو ئەدەبێك کە ئامادەییەکی جیهانی یان ناوچەیی هەبێت گرفتی هەیە، ئەدەبی زمانی ژێردەست، ئەدەبی شوناسێکی ئەنفالکراوە، ئەدەبی زمانی کۆمەڵگایەکە کە چەکێکی کۆکوژ، ئامرازێکی چەپێنەر نەماوە بەکارنەیەت لەتێکشکانی زمان و سڕینەوەی شوناسی ئەو زمانەدا، هەروەها لەتێکشکان و چەپاندنی سایکۆلۆژیای زمان و دەنگهەڵبڕین و قسەکردن و گوزارشتکردن، تراژیدیا ئینسانییەکانی کۆمەڵگای ئێمەو واقیعی سیاسی ژیانی کۆمەڵگای ئێمە سێبەری بەهێزی خۆی خستۆتە سەر تەواوی سفیری دونیای ئەدەبی و ڕووناکبیریی ئێمە، بەدەگمەن نووسەرێك دەبینیت کە لەدەرەوەی ئەو سفیرە کار لەسەر بابەتێکی دی بکات، بەڵکو ئالودەبوونی کۆمەڵگای ئێمە بەژیانێکی تراژیدی و واقیعێکی سیاسی ئاڵۆز، لێوانلێو لەئاوارەبوون و زوڵم و مەینەتی و کۆمەڵکوژیی و ژیان لەگەڵ خوێن و فرمێسکدا هەلومەرجێکی سایکۆلۆژی وەهای خولقاندووە کە تەنانەت قسەکردن لەسەر سێکس و لەباوەشگرتنیش

لەدواجاردا بچێتەوە سەر تراژیدیا سیاسییەکان و ئەو شکانە دەروونیی و مێژووییەی کە سایکۆلۆژی ئینسانیمان تووشتی هاتووە، دەتوانم دڵنیابم لەوەی کە ئەدەبی کوردی بەو ژانرە ئامادانەی کە هەیە هەمیشە دەستی بۆ ئەنفال بردووە، بەڵام پرسیار لەسەر چەندێتی و چلۆنایەتی ئەو دەستبردنە دەگەڕێتەوە سەر ئاستی ئەدەبی کوردی خۆی لەکۆنتێکسی گشتیدا کە ئەدەبێکە بەکاراکتەرێکی رۆشنبیری لاوازەوە، بەئامادەگیەکی پڕ لەدوکەڵی سیاسەت و شکستە سیاسییەکانەوە، پڕی لەدەنگی کۆو سەرنگومبوونی دەنگی تاک و خەونەکانی، ئەدەبێکە پیاهەڵدان و لاواندنەوەو گێڕانەوەی هەست و گوزارشتکردن لەحاڵەتەکانی زۆرتر تێدایە لەدەنگی تاك، خەونی تاك و پرسیاری جدی و گەڕان و موغامەرە، ئەدەبی زمانێکی بندەست و کۆمەڵگایەکی پەرواوێزخراوە لەئاستی دونیادا، راستە بەهەزاران دەقی ئەدەبی! لەسەر ئەنفال بەرهەمهاتووە، بەڵام زۆرێك یان بڵێم تاك وتەراو دەگمەن نەبێت، کەدەقێکی هونەری بێت، یان بابەتێکی زانستی و ئەکادیمی، هەڵگری پرسیار ئیدی ئەوانی دی رەشکردنەوەی رۆژنامەکان و داڕستنی ئینشای پڕ لەهەست و لاواندنەوەی مردووەکانە، بەو جۆرە دەقانە نە ئەنفال دەبێتە کتێبێك لەڕێگایەوە دونیا ئازارەئینسانییەکانی ئێمەی تێدا بخوێنێتەوەو هەستی پێبکات، نە دەقێك کە مەعریفە بەرهەمبێنێت بۆ تێگەیشتن ئەنفال و مەرگی ناو ئەنفال و دونیای مرۆڤەکانی ناو ئەنفال و پرسیارەکانی ناو ئەو رووداوە.

پانتایی دەسەڵاتی ئەدەب پانتاییەکی زۆر فراوان نییە، رۆمانێك وەکو بڕیارێکی سیاسی ناتوانێت کاریگەری راستەوخۆی هەبێت لەسەر بردنە



پێش و گۆڕینی رووداوەکان، ئەگەر دەقێکی ئەدەبی تەنها دونیایەکی ئەخلاقی و گرێیەکی ئینسانیمان نیشانبدات، سەرنجمان بۆ پنتێکی پەنهان رابکێشێت لەبونیادی مرۆڤدا، مانای بەرهەمهێنانی گۆڕینی راستەوخۆی نابەخشێت.

**پرسیار:** ئایا ئاستی ئەو ترسە شاراوەیەی لای ئینسانی کورد هەیە بەرامبەر کوردبوونی خۆی، ترسێکە خاوەنی هێزێکی رۆشنبیریی وایە کە بتوانێت لەبری تۆڵە خۆبکات بەهێزێك کە هەڵگری لێبووردن بێت، ئایا ئەم هێزە چەند دەسەڵاتی کوردی لێی بەرپرسیارەو چەندیش کۆمەڵگای کوردی و رۆشنبیرەکانی بەرپرسیارن لەنیشاندانی؟

**دڵسۆز حەمە**: هەتا ئەو ترسە شاراوەیە لەسایکۆلۆژیەتی مرۆڤی کوردا ئامادەیی هەبێت ناتوانین قسە لەسەر داکوتانی پایەکانی گیانی بەخشین و تۆلەرانسی و ئاشتبوونەوەی کۆمەڵگاو هێزە جیاوازەکان بکەین، ئەو ترسەیش لەسایکۆلۆژی و مێژووی کۆمەڵگای کوردا ترسێك نییە لەشوێنێکی نادیار یان لەڕووداوێکەوەو لەئاسمانەوە هاتبێتە ناو دڵ و هەستمانەوە، بەڵکو ئەوە ترسێکە درێژایی مێژوویەکی هەڵکشاو لەخوێن و فرمێسك، مێژوویەك لەسڕینەوەو سووتان و وێرانکردنی سیستماتیکی رۆحی و فیزیکی ئینسانی کورد، مێژوویەك لەفریودان و شکست و هەستانەوە کە سەراپای سایکۆلۆژی کۆمەڵگای کوردی تووشی دەیان دەردی مێژوویی کوشندە کردووە، ئەو تاقیکردنەوە تاڵ و دژوارانەی کە چەکێك و ئامرازێکی کوشتن و ئازاردان و وێرانکردن نەماوە لەجەستەی

ئەو میللەتەدا تاقینەکرابێتەوە تا گەیشتە (ئەنفال) کە ئیدی لوتکەی بەربەرییەت و دڕندەیی و بێمۆراڵی و دڵڕەقی لەشەرمەزارترین شێوەدا نمایشی ئەوپەڕی توانا وێرانکەرەکانی خۆی بەسەر جەستەی ئەو کۆمەڵگایەوە دەکات، ئەو ترسەش لەناوەڕۆکی ئەو کارەساتانەوە سەرچاوەی گرتووە، ئایدۆلۆژیای فاشیزمی بەعس، کەمالیزم لەتورکیاو لەسەر پایەی نکوڵیکردنی ئینسانی کوردو پێشیلکردنی کەرامەت و هەموو بونیادو بەهای مرۆڤانەی کۆمەڵگای کوردی خۆی هەڵچنیوە، ئەم تێزی بیرکردنەوەو هەڵسوکەوتە تا ئێستاش لەنمایشی دەوڵەت و هێزە عەرەبیەکانی ناو عێراقی دوای بەعسیشدا درێژەی هەیە، کەلتوری بەعس، کەلتورێکە کە زۆرێك لەهێزە عەرەبیەکان لەئێستادا کاری پێدەکەن، تورکیا هەڵسوکەوتی هێندە ئیستیبدادی و دڵڕەق و سەرسەختانە لەهەمبەر ئینسانی کوردو بونیادی کوردبووندا هەڵسوکەوت دەکات کە ئەم شێوازی ئاپارتایدو هەلاواردنە بۆتە فەرهەنگێکی کۆمەڵایەتی و دابەزیوەتە ناو هەرەبازنەکانی خوارەوەی ستراکتۆری کۆمەڵایەتی، دەوڵەتی تورك گیانی شەڕەنگێزیی و بێزاریی خۆی هەرهێز ناشارێتەوە لەو ئیدارە کوردییەی کە لەکوردستاندا ئێستا دەسەڵاتی هەیەو حاکمە، بەڵکو بەهەزاران سەربازو چەك و دەبابەو زرێپۆشەوە خۆدەکات بەو خاکەدا کە یەکێك لەئامانجە سیاسییەکانی رەنگە شکانی حورمەت و هەیبەتی مەعنەویی ئەو ئیدارە کوردییەو دروستکردنی گرفتی سایکۆلۆژی بۆیان، ، لەناوخۆی عێراقی دوای سەدام حوسەینیش، زۆربەی ئەو هێزە عەرەبیانەی کە لەعێراقدان هەڵگری سروشتی ئیسلامی و عروبەوین و



زۆرێکیان بەڕاشکاوی و نایشارنەوە کە هەمیشە کورد بەشێوەیەك لەشێوەکان دەبێت لەپاشکۆی عێراق و لەبندەستی دەسەڵاتی مەرکەزی، بەمانای دەسەڵاتی عەرەبی عێراقیدا بمێنێتەوە. تا هەنووکە هیچ هێزێکی عەرەبی بەفەرمی و نافەرمی داوای لێبووردن و بەخشینی لەمیللەتی کورد نەکردووە لەهەمبەر کارەساتی ئەنفال و هەڵەبجەدا، بگرە ئەوان زۆر سادەتر خۆ لەوە دەدزنەوە کە ئەوانە رژێمی پێشوو ئەنجامی داوە، بەو بەهانەیە تا هەنوکە خۆیان لەپرۆسەیەکی وەها دزیوەتەوە.

لەملاشەوە دەسەلاتی کوردی نەك هەڵگری پڕۆژەی تۆلەرانسی و ئاشتبوونەوەی سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی نییە، بەڵکو ئەو خۆی رێگرە لەبەردەم پرۆسەیەکی وەهادا، هیچ کات کۆمەڵگای کوردی وەکو ئەم ساتەوەختە کۆمەڵگایەك نەبووە لەدابەشبوونێکی دەرونیی و سیاسی و لێکترازانی دەرونیی و ئەخلاقی ترسناکدا بژی، ئەنجامی ئەو دابڕانە ترسناکەی لەنێوان تەبەقەی سیاسی و کۆمەڵانی خەڵکا دروستبووە، ئەو تەبەقە دەسەڵاتدارەی کە لەسەردەمی زێڕینی دەسکەوتی ئابوری و دەسکەوتی سیاسی و دەسکەوتی دەسەڵاتدا دەژی، کە ئەم سێ فاکتەرە لەدەستی ئەو هێزانەی کە خاوەنی پڕۆژەیەکی نیشتیمانی و پرسی دیموکراسی و پێشکەوتنخوازانە نین، بەڵکو لەسەرقاڵی کۆکردنەوەو پەلاماردانی سەرمایەو دەسەڵات و پارەوپولدا، هەموو سنوورێکی پرەنسیپە نیشتمانی و ئەخلاقی و تەنانەت یاساییەکانیشیان تێپەڕاندووە، نەك هەر دەیان خایین و ئەنفالچی و خەڵکانی خۆفرۆش و گومانلێکراویان جێگا کردۆتەوەو پێگەی سیاسیشیان داوە بەوانە، بەڵکو لەوەش

بەولاوەتر، مۆدێلێکی سیاسی و دەسەڵاتی سیاسی بەڕێوەدەبەن کە تەبەقەیەکی خۆشگوزەرانی دەوڵەمەندی بەهێز، بەپارەو دەسەڵات، لەولاشەوە کۆمەڵگایەك لەسەر پاشماوەی ئابوری و سیاسی و ئیعلامی ئەوان دەژی، بەقوربانییانی ئەنفالیشەوە، مۆدێلێك کە پانتایی پێکەوەژیان و هارمۆنی کۆمەڵایەتی و یەکتر قەبووڵکردن تەسکتر بێتەوە کە ئەوانە پایەکانی تۆلەرانسی و لێبووردەیین، ئەو مۆدێلی ئیدارەیە هاووڵاتییەك بەرهەمدێنێت کە ئامادەیی گفتوگۆو یەکتر قەبووڵکردن و تۆلەرانسی کەمتر بێت، پایەکانی دابینکردنی تۆلەرانسی و پێکەوە ژیان، پێکەوە هەڵکردن بەمانای دابینکردنی عەدالەت، کۆمەڵگای قانوونە بەبێ جیاوازیی لەهەموارکردنی یاساکاندا، ئەوەی لەکوردستاندا تەواو پێچەوانەی کارکردنی میکانیزمی تۆلەرانسی و پێکەوە ژیانە.

رۆشنبیری کورد ئەگەر لەناو ماشێنی یەکێك لەو هێزە گەورانەدا کاربکات ئەوا لەداوجاردا دەبێتە بەشێك لەسروشتی خۆزاڵکردنی ئەو هێزانە، ناتوانێت خاوەنی خیتابێکی ئینسانی بێت بەئاراستەی بەرهەمهێنانی تۆلەرانسی. ئەوەش حاڵی زۆرینەی هێزە رۆشنبیری و تەنانەت زانستی و زانکۆکانیشە کە دابەشبوونێکی سیاسی دابەشبوون.

لێبووردەیی لەساتەوەختی بەردەوامی کارەسات و بەردەوامی هەلومەرجی بەقوربانیبووندا روونادات، لەهەلومەرجی هاوسەنگبوونی ماف و کوژاندنەوەی هەڕەشەو مەترسییەکاندا روودەدات، لێبووردەیی و پێکەوەژیان حەتمیەتی لۆژیکی و ئەخلاقی لێکترازان و کێشمەکێشمە مێژووییەکانە لەمێژووی مرۆڤایەتیدا، هەمیشە رۆشنبیرو هێزە



پێشکەوتنخوازو رووناکبیرەکان لەپێشەنگی ئەو هێزانەن بۆ ئەو پرۆسەیە کاردەکەن، ئەوەش دەبێت پرۆژەی رۆشەنبیری کورد بێت، بەتایبەتی لەهەلومەرجی ئێساتدا کە دەسەڵاتێکی خاوەنی دەسەڵاتێکی سەرخۆش و کۆمەڵگایەکین بەتراومایەکی وەکی ئەنفالەوە، بەهۆشیارییەکی بێپرسیارەوە، پرۆسەی لێبووردەیی و بیناکردنی فەرهەنگی تۆلەرانسی لەمێژووداو لەهەمبەر تراژیدیا مێژووییەکان پرۆسەیەکی درێژخایەن و فرەڕەهەندو ئاڵۆزە، دوای تێپەڕینی سەدەیەك بەسەر قەتڵوعامی ئەرمەنەکاندا هێشتا تورکیا ئامادە نییە کە نەك داوای لێبووردن، بەڵکو دان بنێت بەڕوودانی کارەساتەکەدا، ساڵی 2005 و لەساڵیادی شەڕی نورماندی لەفەرەنسا، کە هێزەکانی ئەمەریکا لەکەنداوی نورماندی دابەزین و بۆهاوکاری هێزەکانی ئینگلیزو فەرەنسا کە ئەوکات لەژێر سەرکردایەتی دەیگۆلدا خەریکبوون نازییەکانیان لەپاریس دەردەکرد، لەساڵیادی 2005دا، بۆیەکەمینجار(گیرهارد شرودەر)کە ئەوسا راوێژکاری ئەڵمانیا بوو ئەویش لەو مەراسیمەدا ئامادەبوو دیسانەوە داوای لێبووردنی خۆی پێشکەشی هەموو ئەو گەل و کەس و کۆمەڵگایانە کرد کە لەهێرشی نازییەکاندا وێرانبوون و زیانیان پێگەشتووە، سەرەڕای ئەو ئاکتەی شرودەر، کەچی فەرەنسیەکان زۆر ناڕەزایی و توڕەیی خۆیان نیشاندا، بەڵکو زۆرێکیان لەسەر ئەوە نووسی کە جێگای شەرمەزارییە رێگا بەشرودەر(ئەڵمانیا) بدرێت لەو یادەدا ئامادەبێت، لەکاتێکدا ئەڵمانیا لەدوای کەوتنی نازییەکان و کۆتایی شەڕدا ئایدیۆلۆژی نازیی و پارتی سیاسی نازییەکان و هەر رێکخراوێك پیادەی نەزعەی نازی بکات بەیاسا

قەدەغەکراوەو دادگای بەناوبانگی (نۆرمبرگ) لەهەمبەر زۆرێك لەسەرکردە نازییەکاندا. داوای لێبووردنی رەسمیی لەجولەکەو تەواوی ئەو وڵاتانە کراوە کە هیتلەر وێرانیکردوون، بگرە ئەڵمانیا لەپێشەنگی ئەو وڵاتانەدایە کە دەیان سەنتەری زانستی و لێکۆڵینەوەی دامەزراندوە بۆ لێکۆڵینەوە لەتراژیدیای جولەکەکان و ژووری غازەکان و دۆکیۆمێنتی چۆنیەتی لەناوبردنی ئەو هەموو خەڵکە بێگوناهە، جگە لەڕسواکردنی هیتلەرو پیشاندانی شەڕەنگێزیی و سایکۆلۆژی و ێرانەکاری هیتلەر، ئیدی بیناکردنی فەرهەنگی لێبووردەیی و تۆلەرانسی لەئەنجامی لەبردن و دادگاییکردنی مێژوویی هەموو ئەو ئایدیۆلۆژی و شێوازی بیرکردنەوەو هەڵسوکەوتانەی کە هەڵگری نازیزم و شەڕەنگێزیی و چەوساندنەوەی ئەوانی ترە.